کەسێکی صاحیبی جەرگ [ یەعنی رۆحلەبەر ] بیخوا ئیللا نیوە ویسقێ جۆ نەبێ لە رەفەیێکا بوو لێم خوارد تا درەنگێ لە دوایيا پێوام بڕایەوەو نەما.

لەم سێ حەدیثەدا زۆربوونی طەعامی کەمی تیایە بە بەرەکەتی حەزرەتی رەسوولی ئەکرەم ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ .

حوکمیشیان وایە بۆ ئینسان سوننەت وایە رزقی ناومالّی نەپێوێ کە چەندە مەعدوود بێ ، یا پارە بێ نەیژمێرێ ، بەوە بەرەکەتەکەی ئەڕوا ؛ چونکی ئیعتیماد ئەداتە سەر میقدارەکەی کە بەشی چەند رۆژ ئەکا ، کە تێیگەیی‌و زانی کە بەشی چەند رۆژ ئەکا ، لە دوای موددەیێ ئەبڕێتەوە ، بە مەجهوولیی بمێنێ بەرەکەتەکەی باقیی ئەبێ ؛ چونکی ئیعتیمادی ناداتە سەر هەر ئیعتیمادی بە خوا ئەبێ ، کە وابێ ئەوی لە ناو خەلّقا مەشهوورە کە ئەلّێن : مەیژمێرە با کەم نەبێتەوە ، موافیقی ئەم حەدیثانەیە .

فەقەط ئینسان شتێ بدا بە کەسێ یا لە کەسێکی وەرگرێ لەو وەختەدا ئەبێ میقدارەکەی تەعیین بکا ، باقیەکەی کـــە لای ئەمێنێتەوە بـــا بـــە مەجهوولی بمێنێتەوە . ئۆبەتکێشی بە دیار مالّیەوە دانابێ ، بە حســـاب تەسلیمی بکاو بە حساب وەری‌بگرێتەوە ، ئەم نەوعە موعامەلانە بۆ دەفعی ئیختیلافە ، داخلّی ئەم حەدیثانە نیە ، وەکـــوو فەرموویەتـــی : « کیلوا طعامکم یبارك لکم فیه » طەعامی خۆتان بپێون ، ئەگەر بی‌پێون بەرەکەتی بۆتان تێ‌ئەکەوێ ، موراد وایە لە وەختی وەرگرتنا بی‌پێون بەرەکەتی بۆتان تێ‌ئەکەوێ ، ( من القسطلاني ) .

١٥/٥٥٣ ـ عن المقداد [رضي الله تعالى عنه] قال : أقبلت أنا وصاحبان لي وقد ذهب أسماعنا وأبصارنا من الجَهْد [أي الجوع] قال : فجعلنا نَعْرِض أنفسنا على أصحاب رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فليس أحد منهم يقبلنا [لأنهم كانوا مقلّين] فأتينا النبي ـ صلى الله تعالى

عليه وسلم ـ فانطلق بنا إلى أهله ، فإذا ثلاثة أعْنُزٍ ، فقال النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ: احتلبوا هذا اللبن بيننا ، قال : فكنا نحتلب فيشرب كل إنسان منا نصيبه ونرفع للنبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ نصيبه ، قال : فيجيء من الليل فيسلم تسليما لا يوقظ نائما ويسمع اليقظان، قال : ثم يأتي المسجد فيصلي ثم يأتي شرابه فيشرب •

**تەرجەمە :**

میقداد ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : من‌ودوو رەفیقم رووما‌ن‌کردە مەدینە ، لە برسانا گوێمان‌و چاومان قووەتیان ڕۆیی بوو ، خـۆمـان[1] عەرزی صەحابەی پێغەمەر کرد ـ صلی الله تعـالی علیه وسلم ـ هیچ کەس نەبـوو لەوان کـە قەبووڵمان بکـا [ چـونکی نەیان‌بوو ] چووینە خدمەت پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ بردینیە ماڵەوە سێ مەڕی[2] لێ‌بوو، پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : ئەو مەڕانە بدۆشـن شیرەکەیان لە بەینمانا شەریکی بێ میقداد فەرمووی : ئەمان‌دۆشـین هەرکەس بەشی خۆی ئەخواردەوە ، بەشی پێغەمەرمان ـ صلی الله تعالـی علیه وسلم ـ هەڵەگرت ، شەو تەشریفی ئەهات سەلامی ئەکرد ، نوستووی خەبەر نەئەکردەوە بە بێداریشی ئەبیست • میقداد فەرمووی : لە دواییـا تەشریفی ئەچۆوە مزگەوت نوێژی ئەکرد ، لە دواییا تەشریفی ئەهات بەشە شیرەکەی خۆی ئەخواردەوە •

فأتاني الشيطان ذات ليلة وقد شربت نصيبي فقال : محمد [ صلى الله تعالى عليه وسلم ] يأتي الأنصار فيتحفونه ويصيب عندهم :

---

(۱) خۆمان ... ئەگەر بگوترێ خۆمان عەرزی صەحابەی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ئەکرد ـ واتە : ئەچووینە لایان‌و داوای خواردنمان لێ ئەکردن ـ باشـترە •

(۲) ئەگەر لێرەدا بزن بنووسرێ باشترە •

شەوێ شەیتانم هاتە لا من بەشە شیری خۆم خواردبۆوە ، وتـی : محمد ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەشریفی ئەچێتـــە لای ئەنصار ئەوان ئیکرامی ئەکەن لای ئەوان خواردنی دەست ئەکەوێ •

ما به حاجة إلى هذه الجرْعة فأتيتها فشربتها ، فلمـا أن وغلت فـي بطني وعلمت أنه ليس إليها سبيل ، قال : ندمني الشيطان فقال : ويحـك ماصنعت ؟! أشربت شراب محمد ـ صلى الله تعالى عليه وسـلم ـ فيجيء فلا يجده فيدعو عليك فتذهب دنياك وآخرتك !؟ وعليَّ شملة إذا وضعتها على قدمي خرج رأسي ، وإذا وضعتها على رأسي خرج قدماي ! وجعل لا يجيئني النوم ، وأما صاحباي فناما ولم يصنعا ما صنعت ، قال : فجاء النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فسلم كما كان يُسلِّم ، ثم أتى المســجد فصلى ، ثم أتى شرابه فكشف عنه ، فلم يجد فيه شيئا ، فرفع رأسه إلى السماء ، فقلت : الآن يدعو علي فأهلك ، فقال : اللهم أطعـم من أطعمني واسـق من سـقاني :

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئیحتیاجیی بەم قومە شـــیرە نیە ، چووم بە لای شیرەکەوە خواردمەوە ، کە جێگیر بوو لە زگما زانیم ئیتر چارەی ناکرێ •• شەیتان پەشیمانی کردمەوە پێیوتم : کۆستکەوی چیت کرد ؟! شەرابی محمدت ـ صلى الله تعالى عليه وســـلم ـ خواردەوە ئێستە تەشریفی بێت خواردنەوەکەی لە جێی خۆی نادۆزێتەوە دۆعات لـێ ئەکا بە هیلاکا ئەچی دینو دنیات ئەڕوا ! خۆداپۆشێکم بە سەرەوە بـــوو بمدایە بەسەر پێما سەرمی لێ ئەچوە دەرێ ، بمدایە بە سەرما پێمی لـێ ئەچوە دەرێ ! ئیتر خەوم لێ تەقی ، خەوم نەدەهات ، (لکن) رەفیقەکانم نوستن ، چونکی ئەوی من کردبووم ئەوان نەیانکردبوو • میقداد وتی :

پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ تەشریفی هات وەکوو عادەتی خـۆی سەلامی لێ کردین ، لە دواییا تەشریفی چوە مزگەوت نوێژی کرد ، ئەمجا تەشریفی هات بە لای خواردنەوەکەیەوە هیچی تیا نەدۆزییەوە ، ســـەری موبارەکی هەڵبڕی بۆ ئاسمان ، وتم : هەر ئێستە دۆعام لێ ئەکا هیـلاك ئەبم ، فەرمووی : خوایا کێ شتم دەرخوارد بدا تۆیش شـــتی دەرخوارد بدە ، کێ ئاوو شەربەتم بداتێ بیخۆمەوە تۆیش ئاوو شـــەرابی دەرخوارد بادە .

قال : فعمدت إلى الشملة فشددتها علي وأخذت الشَّفرة [بضم الشين وفتحها ] فانطلقت إلى الأعنز أيها أسمن فأذبحها لرسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فإذا هي حافلة وإذا هن حُفَّل كلهن ، فعمدت إلى إناء لآل محمد ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ما كانوا يطمعون أن يحتلبوا فيه ، قال : فحلبت فيه حتى علَتْه رغوة ، فجئت إلى رســـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقال : أشربتم شرابكم الليلة ؟ قال : قلت : يارسول الله اشرب ، فشرب ، ثم ناولني فقلت : يارسول الله اشرَب ، فشـرِب ، ثم ناولني ، فلما عرفت أن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قد روي وأصبت دعوته ضَحِـكتُ حتى ألقيت على الأرض ، قال : فقال ـ صـلى الله تعالى عليه وسلم ـ: احدى سوآتك يا مقداد ، فقلت : يا رسول الله كـان من أمري كـذا وكـذا وفعلت كـذا ، فقـال النبـي ـ صـلى الله تعـالى عليـه وسـلم ـ : ماهذه إلا رحمـة الله ـ عـز وجل ـ أفلا كنت آذنتني فنوقظ صاحبينا فيصيبان منها ، قال : فقلت : والذي بعثك بالحق ما أبالي إذا أصبتها وأصبتها معك من أصابها من الناس م ـ ٩/٣٣٨ .

**تەرجەمە :**

میقداد ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : ئەوەی خۆم پێ داپۆشیبوو دەستم

دایێو گرێم‌دا به خۆمەوه ، کێردم هەڵگرتو چووم به لای مەڕکانەوه که کامیان قەڵەوه سەری ببڕم بۆ پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ [ تا بەرەکەتی دۆعاکەییم بۆ بێ ] کەچی ئەوەیان که قەڵەو بوو گوانی پڕ له شیر بوو ، تێفکریم هەموویان گوانیان پڕ شیر بوو ، قاپێکی ماڵی پێغەمەرم ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ هێنا کـــه ئومێدیان نەبوو که شـــیری تێدادۆشن [ چونکی ئەو مەڕانه دۆشرابوون ، رەنگه مەڕی تریشـــیان نەبووبێ که شیریان لێ بدۆشرێ ] فەرمووی : شیرم دۆشییه تاو تا کەفی لێ نیشتو کەوته سەری ، چوومه خدمەت پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : ئیمشەو خواردنەوەکەی خۆتان خواردۆتەوه ؟ وتم : ( یا رسول الله ) بخۆرەوه ، خواردیەوه له دواییا قاپەکەی دایەوه دەستم ، وتم : ( یا رسول الله ) بخۆرەوه ، خواردیەوەو قاپەکەی دایەوه دەستم ، که زانیم پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ تێری خواردەوەو دۆعای پێغەمەرم ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ به نەصیب بوو پێکەنیم تا کەوتمه ئەرز ! پێغەمەر ـ صـــلی الله تعالی علیه وســـلم ـ فەرمووی : یا میقداد ئەمەیش یەکێکه لەو خراپیانەی که کردووته [ یەعنی پێم بڵـێ چیت کردوه تا وا پێ ئەکەنی ؟ ] وتم : ( یا رسول الله ) کردەوەم ئـەوه بوو ئـەوه بوو ئەوه بوو وام کرد ، یەعنی چی کردبوو عەرزی کرد • پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : ئەوه رەحمەتێکه که له طەرەفی خواوه بوه ـ عز وجل ـ نەبوو پێم‌بڵێی که دوو رەفیقەکەی تریشمان خەبەرکەینەوه ئەوانیش لێیان بخواردایەوه ؟ وتم : قەسەم بەوەی تۆی به پێغەمەری حەق ناردوه هیچ باکم نیه که تۆ خواردتەوەو من له خدمەت تـــۆدا خواردمەوه لەوەی خەڵقی تر بخواتەوه • یەعنی یا نەخواتەوه •

**جیهەتی ئیعجازی :**

مەڕەکان له دوای ئەمه که دادۆشرابوون هیچ شیر له گوانیانا نەمابوو

بە بەرەکەتی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ شیر هاتەوە گوانیان کە لێی تێربوون •

**ئەحکـامی :**

١ ـ ئینسان کە موحتاج بوو بۆی دروستە کە عەرزی حاڵی خۆی بکـا بەکەسێ کە ئومێدی پێی بێ کە دەفعی ئیحتیاجیەکەی بکا •

٢ ـ ئینسان شتێکی نابەجێی کرد لازمە لێی پەشیمان ببێتەوەو تۆبەی لێ بکا •

٣ ـ ئینسان تابیعی نەفسی بوو ئیشێکی کرد عاقیبەتەکەی پەشیمانییە قەت شتێکی وا نەکا لەوانە بێ عاقیبەتەکەی پەشیمانیی بێ •

٤ ـ ئینسان چوە ناو جەماعەتێ یا لای یەکێ سوننەتە سەلامی لێ بکا •

٥ ـ بێ لوزووم خەولێکەوتوو خەبەرنەکرێتەوە •

٦ ـ سوننەتە ، بەڵکو واجبە ، شوکری نیعمەتی خوا بکرێ •

٧ ـ ئیعتیراف بە قوصوورو ئیعتیذار لای ئەوەی کە قوصووری دەرحەقی کردوە •

٨ ـ چاولەقوصوورپۆشین سوننەتە •

٩ ـ دۆعاکردن بۆ موحسینو خدمەتکارو هەموو چاکەکەر •

١٠ـ موقابەلەی خراپە بە چاکە •

١١ـ ئەخلاقی گوزیدەی حەزرەتی ریسالەتپەناە ـعلیه صلوات اللهوسلامهـ

١٢ـ ئیظهاری سوروور لە دوای زەوالی غەمو حوزن •• هەموو سوننەتن •

٥٥٤/١٦ ـ أيمن الحبشي قال : أتيت جابرا ـ رضي الله تعالى عنـه ـ فقـال : إنا يوم الخندق نحفر فعرضت كُدْيَة [ كَيْدة • ابـن عسـاكر ]

شديدة [ قطعة صلبة من الأرض ] فجاؤا النبي ـ صلى الله تـعالى عليـه وسلم ـ فقالوا : هذه كُدْيَة عرضت في الخندق ، فقال : أنا نازل ، ثم قام وبطنه معصوب بحجر ، ولبثنا ثلاثة أيام لا نذوق ذواقا ، فأخذ النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ المِعْولَ [المسحاة] فضرب فعاد كثيبا [رملا] أهيل أو [ قال ] أهيم [أي سائلا] فقلت : يارسول الله ائذن لي إلى البيت [فأذن لي • أبو نعيم] فقلت لامرأتي : رأيت بالنبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ شيئا ماكان في ذلك صبر ، فعندك شيء ؟ قالت : عندي شـعير وعَنَاق [كارژۆڵەی مێ] فذبحت العناق ، وطَحَنَتِ الشعير ، حتى جعلنا اللحم في البرمة •

## تەرجەمە :

ئەیمەنی حەبەشیی ئەفەرموێ : چوومە لای جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : ئێمە لە رۆژی خەندەقا خەندەقمان هەڵەکەن ، ئەرزێکی زۆر سەختمان هاتەبەر قوڵەندە کاری لێ نەئەکرد ، چوونە خدمەت پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : مـــن ئێمە خوارێ ، لە دواییا تەشریفی هەڵسا زگی موبارەکی لە برسانا بە بەردێ بەستبوو[1] ، ئێمەیش سێ رۆژ بوو وەستابووین هیچ شـــتێکمان نەخوارد [ و نەخواردەوە ] پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قوڵندەکەی وەرگرت کە لە ئـەرزە رەقەکەی دا بوو بە لمێکی جاریی وەك ئاو ! وتم : ( یا رســـول الله ) ئیذنم بـدە تا ماڵەوە ، ئیذنی دام [ کـە چوومە ماڵەوە ] بە ژنەکەم وت [ کە سوهەیلەی بینتی مەسعوودی ئەنصارییە ] : برسێتییەکم دی بـــە پێغەمەرەوە ـ صلى الله تعالى عليـه وسلم ـ کە صەبری تیا ناکرێ ، هیچت

(1) ئەگەر لێرەدا بیفەرموایە : بەردێکی لەسەر سکی بەســتبوو ، یـان دانابوو .. باشتر دەبوو .

لە لا هەیە ؟ وتی : مەنێ جۆو کارژۆڵەیێکم لایە • کارژۆڵەکەم سەربڕی ، ئەویش جۆیەکەی هاڕیی ، تا گۆشتەکەمان خستە ناو دیزەوە بکوڵێ •

ثم جئت النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ والعجين قد انكسر ، والبرمة بين الأثافيّ قد كادت أن تنضج [كلما نضجت[1]• الآية] فقلت : طُعَيِّمٌ لي ، فقم أنت يا رسول الله ورجل أو [شك الراوي] رجلان• قال: كم هو؟ فذكرت له ، قال : كثير طيب • قال : قل لها لا تنزع البرمـة ولا الخبز من التنـــور حتى آتي • فـقال : قوموا ، فـــقام المهاجـرون والأنصـــار :

**تەرجەمە :**

لە دواییا چوومە خدمەت پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم هەویرەکە هەڵاتبوو ، دیزەکەیش لەسەر سێکوچکە بوو نزیك بوو بکوڵێ ، عەرزی پێغەمەرم کرد ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : کە کەمێ طەعاممان هەیـــە هەڵسە ( یا رسول الله ) خۆتو پیاوێ یـــا دوو پیـــاو تەشریفتان بێ ، فەرمووی : طەعامەکەتان چەندە ؟ عەرزمکرد • فەرمووی : زۆرو پاکە • پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : پێیبڵێ : تا من ئێـــم دیزەکە دانەگرێ ، نانەکە لە تەنوورەکە نەکاتەوە • فەرمووی : هەڵســـن موهاجیرو ئەنصار هەموویان تەشریفیان هەڵسا •

فلما دخل على امرأته ، قال : ويحكِ ! جاء النبي ـ صلى الله تعـالى عليه وسلم ـ بالمهاجرين والأنصار =ومن معهم= قالت : هـل سـألك ؟ قلت : نعم • [ وفي رواية يونس قال : فلقيت من الحياء ما لا يعلمه إلا الله ـ عز وجل ـ وقلت : جاء الخلق على صاع من شعير وعناق! فدخلت على امرأتي : اقول : افتضحتِ : جاءك رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه

(1) النســـاء / ٥٦ •

وسلم ـ بالجند أجمعين • فقالت : هل كان سألك كم طعامك ؟ فقلت : نعم • فقالت : الله ورسوله أعلم نحن قد أخبرناه بما عندنا • فكشفت عني غما شديدا ] فقال : ادخلوا ولا تضاغطوا [لا تزدحموا] فجعل يكسر الخبز ويجعـل عليـه اللحـــم ويخمِّر البُرمـــة والتنـــور إذا أخـذ منـه ويقـرب إلى اصـــحابـه ، ثـم ينـزع فـلم يـزل يكســـر الخبـــز ويَغْـرِف حتى شبعوا ، وبقي بقية ، قال : كلي هذا وأهدي ؛ فإن الناس أصابتهم مجاعة ح ـ ٣٠٩/٦ ، م ـ ٣٠٨/٨ :

**تەرجەمە :**

که جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ چوەوە لای حەرەمەکەی فەرمووی: کۆستکەوێ ! پێغەمەر ـ صلیاللەتعالیعلیهوسلم ـ هەموو موهاجیرو ئەنصاریی =و ئەوانەی لەگەڵیانانی= بۆ هێنایـــت • فەرمووی : لێیپرســـیت ؟ فەرمووی : بەڵێ [ لە ریوایەتی یوونسا ئەفەرموێ : ئەوەندەم حەیا کـرد غەیری خوا ـ عز وجل ـ کەس نایزانێ ، وتم : خەڵق هاتوونە سەر مەنـێ جۆو کارژۆلەیێ ! چوومـــە لای ژنەکەم وتم : بە فەضیحەت چووی : پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ بە هەموو لەشکرەکەوە بۆتهات • وتی : هیچ لێیپرسیت کە طەعامەکەت چەندە ؟ وتم : بەڵێ • وتی : خواو رەسوولی خوا لە هەموو کەس عالمترن • ئێمە عەرزمان کردوە کە چیمـان هەیە ، بەوە غەمێکی زۆر زۆری لێ لادام ] پێغەمەر ـ صلی الله تعـالی علیه وسلم ـ [ لە دوای ئەمە گەیینە مالی جابیر ] فەرمووی : بێنە ژووری ئەمما مەکەون بەسەر یەکا • پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ نانی بۆ لەتئەکردنو گۆشتی بۆ بەسەرائەکردنو دیزەکـــەو تەنوورەکـــەی

دائەپۆشی‌و . ئەی‌نایە بەردەمی ئەصحابی[1] ، لە دواییا نان‌و گـۆشــتی دەرەهێنا هەروا بەو نەوعە نانی دەرەهێنا‌و ئاوو گۆشتی هەڵەهێنجا تا تێر بوون ، بەقیبەیێکیشی مایەوە ، بە سوهەیلەی فەرموو : ئەمە بخۆو بـە هەدیە بینێرە بۆ دەرو دراوسێ خەڵق گرفتاری برسێتی بوون .

١٧/٥٥٥ ـ سعيد بن مينا قال : سمعت جابر بن عبدالله ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : لما حُفِر الخندق رأيت بالنبي ـ صلى الله تعالى عليـه وسلم ـ خمصا شديدا [أي ضمور البطن من الجوع] فانكفأت إلى امرأتي ، فقلت : هل عندكِ شيء ؟ فإني رأيت برسول الله ـ صلى الله تعالى عليـه وسلم ـ خمصا شديدا . فأخرجت إليَّ جرابا فيه صاع من شعير ، ولنـا بهيمة داجن ، فذبحتُها ، وطحنتِ الشعير ، ففرغَتْ إلى فراغي ، وقطعتُها في برمتها ، ثم وليت إلى رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقالت: لا تفضحني برسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وبمن معه .

**تەرجەمە :**

جابیر ئەفەرموێ : کە خەندەق هەڵکەنرا پێغەمەرم ـ صـلى الله تعالى عليه وسلم ـ زۆر بە برسێتیی دی ، گەڕامەوە بـــۆ لای ژنەکەم ، وتم : هیچت لا هەیە ؟ من پێغەمەرم ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بە برسێتییەکی تەواو برسیی دی ، توێشەبەرەیێکی بۆ دەرهێنام مەنێ جـــۆی تیا بوو ، کارژۆڵەیێکی ماڵەکیشمان بوو سەرم‌بڕی ، ئەویش جۆیەکەی هاڕیی ، تا من لە کارژۆڵەکە بوومەوە ئەویش لە هاڕینی جـــۆیەکە بۆەوە ، کارژۆڵەکەم پارچـە ـ پارچـەکردو خستمە ناو دیزەکەوە ، لـە دواییا چووم بۆ خدمەت

---

(١) واتــە : تریتەکەی ئەنایە بەردەمی ئەصحابی نەك تەنوورەکە ، لێـرەدا پاش‌وپێشێ دروست بوە ، ئەگەر بیفەرمووایە : نانی بۆ لەت‌ئەکردن‌و ئـاوی بـۆ بەســەرا ئەکردن‌و ئەی‌نایە بەردەمیان‌و تەنوورو دیزەکەی دائەپۆشییەوە .. باشتر بوو .

پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وســـلم ـ سوهەیلە پێیوتـــم : ها ئابڕووم نەبەی ، پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـو ئەوانەی کە لە خدمەتیـــان هەموویان نەهێنی •

فجئته فساررته فقلت : يا رسول الله ذبحنا بُهَيمةً لنا وطحنّا صاعـ من شعير كان عندنا ، فتعال أنت ونفرٌ معك • فصاح النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقال : يا أهل الخندق إن جابرا قد صنع سؤرا ، فحيَّ هلاً بكم ، فقال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : لا تُنْزِلُنَّ بُرمَتكم [ ولأبي ذر : لا تُنْزِلَنَّ برمتكُمْ ] ولا تَخْبِزُنَّ عجينكم حتى أجيء • فجئت وجاء رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يقدم الناس ، حتى جئت امرأتي ، فقالت : بك وبك ! فقلت : قد فعلت الذي قُلتِ ، فأخرجت له عجينا فبصق فيه [ بصق ، بسق ، بزق بمعنى ] وبارك ثم عَمَدَ إلى برمتنا فبصق وبارك ثم قال : ادع خابزة فلتَخْبِز معي واقْدَحي من برمتكم ، ولا تُنْزِلوها ، وهم ألف ، فأقسم بالله لقد أكلوا حتى تركوه وانحرفوا ، وإن برمتنا لتَغِطُّ كما هي ، وإن عجيننا ليخبز كما هو ح ـ ٦/٣١٠ ، ، م ـ ٣٠٨/٨ •

**تەرجەمە :**

چوومە خدمەتی بە دزییـــەوە عەرزمکرد وتـــم : ( یا رسول الله ) حەیوانێکی بچکۆلانەمان بوو سەرمانبڕی ، مەنێ جۆمان بوو هاڕیمان ، تۆو چەند کەسێ لە خدمەتتا تەشریفتان بـــێ ، پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ بە دەنگی بەرز بانگیکرد فەرمووی : ئەی ئەهلی خەندەق جابیر شایی بۆ کردوون ! سا خێراکەن بێن • پێغەمەر ـ صلی الله تعالـــی علیه وسلم ـ فەرمووی : تا من ئێم دیزەکەتان دامەگرن ، هەویرەکەتـــان مەکەن بە نان ، من چوومەوەو پێغەمەریش ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ

تەشریفی کەوتە بەردەمی خەڵقەکەوەو هات ، تا چوومــەوە لای ژنەکەم ، وتی : وات لێ بێ‌و وات لێ بێ ! وتم : ئەوی پێت وتم کــردم • ژنەکەم نەختێ هەویری دەرهێنا ، پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ تفـــــی تێ کردو دۆعای بەرەکەتی بۆ کرد ، لە دواییا تەشریفی چوو بە لای دیزەکەوە تفیشی کردە ناو ئەوەوەو دۆعای بەرەکەتی بـۆ کرد ، لە دواییا فەرمووی : ژنێکی نانکەرم بۆ بانگ‌کەن نانم لەگەڵ بکا ، تۆیش لە دیزەکە هەڵهێنجە دایمەگرن ، ئەوان هەزار کەس بوون ، سوێن ئەخۆم بە خوا خواردیان‌و بەجێیان هێشت‌و گەڕانەوەو دیزەکەمان لە بەر پڕیی چۆن بوو وا هەڵەچوو ، هەویرەکەمان هەروەکوو بوو هەروا نانی لێ ئەکرا •

ئەم حادیثەیە چۆن ئەبێ هەزار کەس دیبێتی‌و موتەواتەر نەبێ ؟ مـــن هەر وەك لە پێش چاوی خۆم کرابــــــن ( علم الیقین )م هەیە بەم نەوعە موعجیزانە وەك ئەزانم کە ئەرزو ئاسمان هەن •

موعجیزەی ئەم دوو حەدیثە :

١ ـ بەردێ کە هاتۆتە بەر خەندەقەکەوە خوا ئەزانێ کە چەند صەحابیـــی لەگەڵی خەریك بوون چارەیان نەکردوە ، پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ بە زگی برسێتیی بە تەنها قوڵونگەیێ کە پیاکێشاوە بوە بە تۆز !

٢ ـ کارژۆلەیێك‌و مەنێ جۆ کیفایەتی هەزار کەسی کردوەو بە هەدییـــــە نێرراوە بۆ هەموو فوقەرای مەدینە ، یەعنی کارژۆلەیێك‌و مەنێ جۆ هەموو شاری مەدینەی پێ تێر بوە ، چونکی سیاقی ئەمری پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ بە ناردنی بۆ خەڵق‌و فەرموونـــــــی : خەڵق تووشی برسێتیی بـــوون •• بە واضـــیحیی ئەگەیێنێ کە ســوهەیلە ـ رضي الله تعالی عنها ـ بۆ هەمووی ناردبن • چونکی ئەصحابــی

كيرام ـ رضي الله تعالى عنهم ـ موخالەفەتی ئەمری پێغەمەریان ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لـە هەمـوو موصيبەت‌و فەلاكەتی دنيايی لە لا خراپتر بوە سەرو ماڵيان فيدای ئەو كردوە ـ رضي الله تعالى عنهم ـ

٣ ـ كيفايەتكردنی بۆ هەزار كەس بـــە تەنها مـــوعجيزەيێكە ، كەم نەبوونەوەی بە تەنها موعجيزەيێكە ، زيادكردنەكەيشـی بە تەنهـــا موعجيزەی چوارەمينە[١] .

صەبرو زوهدو قەناعەت‌و حوسنی خولقی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـكە لەم حەديثانە ئەفامرێتەوە ، مەگەر هەر خوا تەقديری بكا ، ئيثاری خەڵق بەسەر ذاتی موبارەكی خۆيا لەوێوە بوەستێ .

خورمازۆربوونی جابير ـ رضي الله تعالى عنه ـ:

١٨/٥٥٦ ـ حدث جابر ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن أباه توفي وعليه دين ، فأتيت النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقلت : إن أبي تـرك عليه دينا ، وليس عندي إلا مايخرج نخلـــه ، ولا يبلـغ مايُخْرِج سنين ما عليه ، فانطلق معي لكي لا يَفْحِش [يَفْحُش] عليَّ الغرماءُ ، فمشى حول بيدر من بيادر التمر فدعا ، ثم آخر ، ثم جلس عليه ، فقال : انزِعوه، فاوفاهم الذي لهم وبقي مثل ما أعطاهم ح ـ ٦/٤٠ .

**تەرجەمە :**

جابير ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : باوكم وەفاتی كرد قەرزدار بوو ، چوومە خدمەت پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ عەرزم‌كرد : كە باوكم قەرزێكی بۆ بەجێ‌هێشتووم هيچيشم لا نيە غەيری ئەوە كـــە

(١) راستتر وايە بفەرموێ ( سێيەمينە ) چونكە دوو موعجيزەی لـــــە پێشەوە گوتوە .

واریداتی دارخورماکانیە ، واریداتی دارخورماکانیشی هی چەند سالی ناگاتە قەرزەکەی کە لەسەریەتی ، تەشریفت لەگەڵم بێ کە صاحیب قەرزەکـــان قسەی زۆر بێمەعناو خراپم پێ نەڵێن [ پێغەمەر ـصلی الله تعالی علیه وسلم ـ تەشریفی چوە ناو باغی خورماکەیەوە ] بە دەوری مشتاخێکا گەڕا دۆعای بەرەکەتی بۆکرد ، لە دوایا تەشریفی بە دەوری مشتاخێکی تـــرا گەڕاو دۆعای بەرەکەتی بۆ کردو لەسەری دانیشت ، فەرمووی : دەری‌هێنن لە مشتاخەکە ، بە تەواوەتی قەرزەکەی پێ ئەدا کردو [ ئەوەندە کـە داینێ ] ئەوەندەیشی مابۆوە •

۵۵۷/۱۹ ـ عن جابر ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : أصيب [ أبـي ] عبدالله [بن عمرو بن حرام ، يوم أحد] وترك عيالا ودينا ، فطلبت إلى أصحاب الدين أن يضعوا بعضا من دينه فأبوا ، فأتيت النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فاستشفعت بـه عليهم فأبوا ، فقال : صنّف تمرك كل شيء منه على حِدَته : عِذْق ابن زيد على حدة ، واللين على حدة ، والعجوة على حدة ••• ثم أحضرهم حتى آتيك ، ففعلت ثم جـــاء ـ عليه الصـــلاة والسلام ـ فقعد عليه وكال لكل رجل حتى استوفى وبقي التمر كما هـو كأنه لم يُمَسّ ح ـ ٤/٢١٨ •

**تەرجەمە :**

جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : عەبدوڵلای باوکم ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە ئوحودا شەهیـــد بوو ، عەیاڵێـــك‌و قەرزێکی زۆری بەجێ‌هێشت ، طەلەبم کرد لە صاحیب قەرزەکان کە شـــتێکی لێ‌داشکێنن نەیانکرد ، چوومە خدمەت پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئەویشم کرد بە شەفاعەتخواز ، شەفاعەتی ئەویشیان قەبووڵ نەکـــرد [ سبحان الله ئەوانەی کە رجای پێغەمەریان ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قەبووڵ نەکرد

ئەبێ چی بووبن ؟! ] پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : خورماکەت صینف ـ صینف خەرمان بکە ، هەر صینفێ بە جوێ : عیذقی ئیبنوزەید بە جوێ [ نەوعێکی چاکە ] ، لیین [ نەوعێکی خراپە ] بە جوێ • عەجوە [ کە چاکترینی هەموو خورماییێکە ] بە جوێ ، لە دوایبا صاحیب قەرزەکان حازر بکە تا بێم • جابیر فەرمووی : کردم ، لە دوایبا پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەشریفی هات لەسەری دانیشت بۆ کوللی صاحیب قەرزێکی پێوا تا قەرزی هەموویانی دایەوە ، خورماکە وەك هیچ دەستی لێنەدرابێ مایەوە •

لم أكتب حديث ناضحه من هذا الحديث لأنه يأتي في أحاديث ( إن شاء الله تعالى )[1] •

٢٠/٥٥٨ ـ وعنه أن أباه توفي وترك عليه ثلاثين وسـقا لرجل من اليهود [ أبو الشحم ] فاستنظره جابر ، فأبى أن يُنْظِرَ ، فكلم جابر رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ليشفع له إليه ، فجاء رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وكلم اليهودي ليأخذ ثمر نخله بالذي لـه فأبى ، فدخل رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ النخل فمشى فيهـا ثم قال لجابر : جُدَّ =له= [أي اقطع] فأوف له الذي له فجدّه بعد مارجع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فأوفاه ثلاثين وَسْقاً وفَضِلَتْ له سبعة عشر وسقا ، فجاء جابر رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ليخبره بالذي كان ، فوجده يصلي العصر ، فلما انصرف أخبره بالفضـل . فقال : أخبر ذلك ابن الخطاب فذهب جابر إلى عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فأخبره ، فقال له عمر : لقد علمت حين مشى فيها رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ليباركَنَّ فيها ح ـ ٢١٢/٤ ، د ، ن ، جه •

---

(١) ئـەم باسـه لە حەدیثی (٥٦٥/٢٧)و حـەدیثەکانی دوای ئەودا بە درێژیی دێت •

**تەرجەمە :**

جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : باوکم وەفاتی کرد سـی وەسق [ هەر وەسقێ شەصت صاع ] قـەرزی خورمـای جوولەکەیێکی بەسەرەوە بەجێ‌هێشتم ، داوای مۆڵەتی لە جوولەکەکە کرد مۆڵەتی نەدا • جابیر عەرزی پێغەمەری کرد ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ کە رجای بـۆ بکا لای جوولەکەکە ، پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسـلم ـ تەشریفی چوو رجای لە جوولەکەکە کرد کە لە باتیی قەرزەکەی بەری خورماکـان قەبووڵ بکا ، نەیکرد ! پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەشریفی بە ناو دارخورماکانا گەڕا ، لە دواییا بـە جابیـری فەرموو : هێشووی خورماکان ببڕە ، قەرزەکەی چیە بیدەرەوە ، لە دوای ئەمە کـە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەشریفی گەڕایەوە جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ بەری خورماکانی بڕی سی وەسق قەرزی جوولەکەکەی بژاردەوەو حەڤدە وەسقیشی زیاد بوو [ جوولەکەکە ئەمجا لە داخا شەق بیا ! ] جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ هات کە خەبەر بە پێغەمەر بـدا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ کە خورماکە لـە قەرزەکە زیاتر بوو ، کـە چوو پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ نوێژی عەصری ئەکرد کە لە نوێژ بۆوە جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەرزی‌کرد کە خورماکە لە قەرزەکە زیاتر بـوو ، پێغەمەر ـ صـلى الله تعالى عليـە وسـلم ـ فەرمووی : بچـۆ خەبەر بە ئیبنولخەطاب بدە ، جابیر چـوە لای عومەر ـ رضـي الله تعالى عنهما ـ خەبەری دایێ ، ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : ئەمزانی کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ کە بە ناو دارخورماکانا تەشریفی گەڕا بەرەکەتی تێ ئەکەوێ •

ئەم حەدیثە بە ظاهیر وا ئەگەیێنێ کە موبایەنەتی لەگەڵ حەدیثەکانـی پێشەوە بێ ، چونکی لەوانا ئەفەرموێ : دوای ئەمە کە خـورمـاکـە

موشتاخ كرا پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم تەشريفى چوو لە سەرى دانیشت ، هەم وایش ئەبێنێ کە بە قەد قەرزەکەی مابێتەوەو هیـچ کەمی نەکردبێ ، لەم حەدیثەدا ئەفەرموێ : کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەشریفی چوو خورماکە بەدارەوە بوە ، ئەمری بە جابیر فەرموو بیبڕێو قەرزی لێبداتەوە ، خۆی تەشریفی گەڕایەوەو جابیر خورماکەی بڕیو قەرزەکەی لێ دایەوەو زیادی کرد ، چوو خەبەری بـــە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ دا لێرەیشا ئەفەرموێ : سی وەسق قەرزی لێدایەوەو حەڤدە وەسقی زیاد کرد کە کەمترە لەو میقدارەی داویەتەوە بە قەرزا •

کەوابێ قەرزی جوولەکەکە سی وەسق بوە بۆ ئەو قەرزە لە پێش بڕینی خورماکەدا پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەشریفی چـوو بە ناویا گەڕاو فەرمووی : بیبڕە • ئەم حەدیثە هەر دەرحەقـی قەرزی جوولەکەکەیە • حەدیثەکانی پێشـــوو دەرحەقـــی قەرزاری ترە غەیری جوولەکەکە ئەوانیش تەنگیان بە جابیر هێناوەو پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بۆ ئەوە تەشریفی بردۆتە بوســـتانەکەی جابیر ـ رضـي الله تعالى عنه ـ کە صاحیب قەرزەکانی تر ئیقناع بکا لەو میقدارەی کـە لـە جوولەکەکە مابۆوە قەرزەکانی تری لێ دایەوەو بە قەد قەرزەکە مایەوە • ( كذا في القسطلاني ) •

ئـەم حەدیثی خورمـای جابیرە ـ رضي الله تعـالى عنــه ـ بوخـاریی ـ رحمه الله ـ لەگەڵێ جێدا ذیکری کردوە ، ئەم میقدارە بەسە •

٥٥٩/٢١ ـ عن عبدالرحمن بن أبي بكر [رضي الله تعالى عنهما ] قال: نـزل علينا أضياف لنا وكان أبي يتحدث إلى رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ من الليل ، قال : فانطلق وقال : يا عبدالرحمـن أفـــرغ من

أضيافك ، قال : فلما أمسيت جئناهم بقراهم ، قال : فأبوا ، قالوا : حتى يجيء أبو منزلنا فيطعم معنا ، قال : فقلت لهم : إنه رجل شديد ، وإنكم إن لم تفعلوا خفت أن يصيبني منه أذى ، قال : فأبوا ، فلما جاء لم يبدأ بشيء أول منهم ، فقال : أفرغتم من أضيافكم ؟ قال : قالــوا : لا والله مافرغنا ، قال : ألم آمر عبــدالرحــمن ؟ قال = وتنحيت عنـــه فـقال يا عبدالرحمن ، قال =: فتنحيت ، قال : فقال : يا غُنْثَر [ بضم الثــاء وفتحها ، يا ثقيل يا جاهل ، يا لئيم ] أقسمت عليك إن كنت تسمع صوتي إلا جئت • قال : فجئت =قال= فقلت : والله ما لي ذنب ، هؤلاء أضيافك فسَلْهُم قد أتيتهم بقِراهم فأبوا أن يطعموا حتى تجيء ، قال : فقـــال : مالكم ألا تقبلوا عنا قِراكم ؟ قال : فقال أبو بكر : فوالله لا اطعمه الليلة• قال : فقالوا : فوالله لا نطعمه حتى تطعمــه • قال : فما رأيت كالشــر كالليلة قط ، ويلكم مالكم الاتقبلوا عنا قراكم ؟ ثم قال : أما الأولى فمن الشيطان هلموا قراكم ، قال : فجيء بالطعام فسمى فأكل وأكلوا • قال : فلما أصبح غدا على النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقال : يارسول الله بروا وحنثت =قال فأخبره= فقال : بل أنت أبرهم وأخيرهم • قـال [الراوي] : ولم تبلغني كفارة م ـ ٣٤٨/٨ •

**تەرجەمە :**

لەم حەدیثەدا موعجیزەی تیـــا ذیـــكر نەكراوە ؛ چونكی عەینی حادیثەكەی حەدیثەكەی دواییە ، لەوا موعجیزەی تەكثیری طەعام ذیـــكر كراوە بەو موناسەبەیە ئەم حەدیثەیشم نووسی •

عەبدورەحمانی كوڕی حەزرەتی ئەبوبەكری صـــەدیق ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : چەند میوانێكمان هات ، باوكیشم بە شەو نە خدمەت حەزرەتی پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قسەی ئەفەرموو،

تەشریفی چوو بۆ خدمەت پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم فەرمووی : ئەی عەبدوڕەحمان لە خدمەتی میوانەکانت بیەرەوە [ یەعنـی چ ئیکرامێ بە عادەت دەرحەقیان لازمە بە تەواویی بەجێی بێنە ] فەرمووی : کە کەوتمە وەختی ئیوارێ نانسان بۆ هێنان نەیانخوارد وتیان : تـــا صاحێبمالەکە نەیێتەوەو لەگەلمان نەخوا ئێمە ناخۆین • پێموتن : صاحیب ماڵ پیاوێکی توندە ئەگەر ئێوە شێو نەکـــەن ئەترســـم لەوەوە ئەذیەتێکم پێ بگا ، ئیستیناعیانکرد ، کە حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالی عنه ـ تەشریفی هاتەوە لە پێش هەموو شتێکا لە میوانەکانی پرسی ؛ فەرمووی : ئیشـــی میوانەکانتان جێبەجێ کردوە ؟ ئەهلی مالەوە وتیان : خەیر وەللاهــــی نەمانکردوە • فەرمووی : بۆ ئەمرم بە عەبدوڕەحمان نەکرد ، عەبدوڕەحمان ئەفەرموێ : لە ترسانا خۆم شاردەوە ، فەرمووی : ئەی رەذیل . ئەی دەنیی ، ئەی جاهیل سوێندت ئەدەم ئەگەر گوێت لە دەنگمە ئەبێ بێی • عەبدوڕەحمان ئەفەرموێ : چووم وتم : وەللاهی هیـــچ گوناهم نیە ، ئەوە میوانەکان لێیان بپرسە نانم بۆ هێنان خۆیان ئیبایان کرد کە بیخۆن تا تۆ بێیتەوە • عەبدوڕەحمان ئەفەرموێ : باوکم پێی فەرموون : بۆچی میواندارییەکەمان لێ قەبووڵ ناکەن ؟ فەرمووی : سا وەللاهی ئیمشـــەو من لەو طەعامە ناچێژم • ئەفەرموێ : میوانەکانیش وتیان : وەللاهی تا تۆ لێی نەخۆی ئێمەیش نایخۆین • باوکـــم فەرمووی : قـــەط وەکوو شەڕی وەك ئیمشەوم نەدیوە ، کۆستانکەوێ ! لەبەرچی ئێـوە ئیکرامی ئێمە قەبووڵ ناکەن ، لە پاشا فەرمووی : ئەو سوێنەی کە =لە= ئەوەلەوە خواردم لە شەیطانەوە بوو ، خێرا نانەکەتان بێنن ، بۆیان هێنان ، باوکم ( بسم الله )ی کردو خواردی ، ئەوانیش خواردیان ، کە سبەینێ بـۆوە بەیانیی تەشریفی چوو بۆ خدمەت پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : ( یا رسول الله ) ئەوان سوێنیان نەکەوتو مـــن سوێنەکەم

کەوت ، پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : خەیر وا نیه تۆ چاکتری ئەوانی ؛ [ چونکی لەبەر خاتری ئەوان سوننەتت بەجێ‌هێنـا دڵی موسافیرەکانت هێنایە جێ ] راویی ئەڵێ : ئەوەمان پێ‌نەگەییوە کـە کەفارەتی دا یا نەیدا ، ( لکن ) دەرحەقی کەفارەت ئایەتیش هەیـــەو حەدیثیش هەیه ( کما یأتي إن شاء الله تعالی في الایمان ) .

لەم حەدیثەدا حوسنی موعامەلە لەگەڵ میوان ، سوێن‌خستن بـــۆ دڵبەجێ‌هێنان ، تەوصییە بە ئیکرامیان ، رەدنەکردنەوەی ئیکرام .... هەیە .

۵٦۰/۲۲ ـ عن عبدالرحمن بن أبي بكر [رضي الله تـعالى عنهما] أن أصحاب الصفة كانوا أناسا فقراء وأن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال مرة : من كان عنده طعام اثنين فليذهب بثالث ، ومن كان عنده طعام أربعة فليذهب بخامس أو سادس ، أو كما قال [عليه الصلاة والسلام] وإن أبابكر [ رضي الله تعالى عنه] جاء بثلاثة ، وانطلق النبي ـ صلى الله تعـالى عليه وسلم ـ بعشرة ، وأبوبكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ بثلاثة ، قال : فهو أنا وأبي وأمي ، ولا أدري هل قال وامرأتي [أميمة] وخادم بين بيتنا وبين بيت أبي‌بكر =قال= وإن أبابكر تعشى عند النبي ـ صلى الله تعـالى عليه وسلم ـ ثم لبث حتى صليت العشـــاء ثم رجـــع فلبث حتى تعشـى =ولمسلم : نعس = رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فجاء بعدما مضى من الليل ما شاء الله . قالت له امرأته [أم رومان] : ماحبســك عن أضيافك ، أو ضيفك ؟ قال : أو عشيتهم [أو ما عشيتهم . كش]؟ قالت : أبوا حتى تجيء ، قد عرضوا عليهم فغلبوهم ، فذهبت فاختبأت فقـال : يا غُنْثَرُ [ أي يا جاهل ، أو يالئيم ، أو يا ثقيل ] فجدَّع [ دعا بقطـع الأنف] وسبَّ ، وقال : كلوا [لا هنيئا لكم . أخرى] وقال : لا أطعم أبدا،

قال : وأيم الله ما كنا نأخذ من اللقمة إلا ربّا من أسفلها أكثر منها حتــى شبعوا وصارت أكثر مما كانت قبل ، فنظر =إليهــا= أبــوبــكر فإذا = هــي = شـــيء أو اكثــر قـــال لامرأتـــه : ياأخت بنــي فــراس [ ما هــذا ؟ اخــرى ] قــالت : لا و [ حــق ] قــرة عينــي لهــي الآن أكــثر منهــا قبــل بثــلاث مــرات ، فــأكــل منهــا أبو بـــكر ، وقــال : إنما كان الشيطان يعني يمينه [إنما كان ذلك من الشيطان •م] ثم أكل منها لقمة ، ثم حملها إلى النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فأصبحت عنده ، وكان بيننا وبين قوم عقد فمضى الأجل فعرفنا [ ففرقنا • أخرى ] اثني عشر رجلا مع كل رجل منهم أناس ألله أعلم كم مع كل رجل غير أنه ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بعث معهم [نصيب أصحابهم] قـــال : أكلــوا منهــا أجمعون ، أو كما قال م ـ ٣٤٣/٨ ، ح ـ ٥٠٨/١ ، ح ـ ٤٠/٦ ، الشك من أبي عثمـــان •[1]

**تەرجەمە :**

عەبدورەحمانی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : ئەصحابی صوففە[2] بەعزێ ئینسانی فەقیر بوون ، پێغەمــەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ دەفعەیێ فەرمووی : هەرکەسێ طەعامی دوو کەسی لە لایە سێیەمینێ بیا لە ئەهلی صوففە ، ئەوی طەعامی چواری لـــە لایە پێنجەمێ یا شەشەمێ بیا ، یا وەکوو پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليــه وسلم ـ فەرموویەتی وای فەرموو [ راویەکە شـــکی بوە کــــە پێغەمەر

(١) دانەر ـ ئەم حەدیثەی لە هەرسێ سەرچاوە دیاریکراوەکە وەرگرتوەو کەمتریش جیاوازیەکانیانی جیاکردوەتەوە .

(٢) صوففە : سەکۆو ساباتێك بوە لە پاڵ مزگەوتی پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ میوانو یارانی بێ کـــەسو لانەو بانـــەی تێـــدا حەوێنراوەتەوە .

ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ پێنجەمـــی فەرموە یا شەشەمی فەرموە ] ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالی عنه ـ سێ کەسی لـێ بردنە ماڵەوە ، پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ دە کەسی لێ بردنە ماڵەوە [ عەبدوڕەحمـان ـ رضي الله تعالی عنه ـ حسابیان ئەکا ئەفەرموێ ] : ئەبوبەکر ـ رضـي الله تعالی عنه ـ سیانی هێنا ، ئێمەیش من دایکمو باوکم [ ئـەبو عوثمانی نەهەدیی ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : نازانم عەبدوڕەحمان ژنەکەی خۆیشی وت یانا ؟ ] عەبدوڕەحمان ئەفەرموێ : خادمێکیشمان موشتەرەك بوو لە بەینی ماڵی ئێمەو ماڵی باوکما [ بەم حسابە بوون بە حەوت ، یا هەشت ، ئەگەر ژنەکەیشی فەرمووبێ ] •

ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالی عنه ـ نانی شێوانی خوارد بە تەنها لـە خزمەت پێغەمەرا ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ، راوەستا تا لە خدمـەت پێغەمەرا ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ نوێژی خەوتنانی کرد ، لە دواییـا لەگەڵ سێ کەسەکەدا گەڕایـەوە ماڵەوە ، لە ماڵەوە وەسـتا تا پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ نانی شێوانی خوارد [ لە دواییا تەشـریفی چوەوە خدمەت پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ لـە خدمەتیا بەنبوو ئەمجا گەڕایەوە بۆ ماڵەوە ، کە تەشریفی گەڕایەوە ئەوەندەی خوا حـەز بکا لـە شەو رابوردبوو ] حەرەمەکەی فەرمووی : لـە میوانەکانت بۆچی ئەوەندە پاشکەوتی ؟ فەرمـووی : شـێوت نەداونـێ ؟ فەرمووی : نەیانخوارد تا تۆ بێیتەوە ، نانیان بۆ بردنو لەگەڵیان خەریك بـــوون میوانەکان غەڵەبەیان بەسەریانا کرد • عەبدوڕەحمان ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەڵێ : چووم خۆم شاردەوە • حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : لەئیم ، رەذیل ، لووتت ببڕن ! جوێنی دا بە عەبدوڕەحمـان ـ رضي الله تعالی عنه ـ بە میوانەکانی فەرموو : عافیەتتان نەبێ بخۆن ، فەرمویشی [ : ئێوە چاوەڕوانی من بوون بۆیە نەتانخواردوە ]بە ئەبەدیی

ئێی چەشکە ناکەم [ ئەوانیش وتیان : وەڵلاهی تا تۆ نەخۆی ئێمەیشـــس ناخۆین ، ئەو وەختە مەجبوور بوو لەبەر خاتری میوانەکانی کە بە برسێتیی نەمێننەوە لێی خوارد • عەبدورەحمان ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەفەرموێ :] وەڵلاهی لوقمەیێکمان لێ هەڵنەدەگرت کە لەژێرەوە لەو لوقمەیە زیاتـــر نەیێتەوە جێی ، تا تێربوون • حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالی عنه ـ تێیفکری کەچیی شتێ بوو بە قەد پێشووی • بە حەرەمەکـەیی فەرموو : ئەی خوشکی بەنیفیراس [ ئوممورۆمان ـ رضي الله تعـالی عنهـا ـ لـە ذورڕییەتی غونمی برای فیراس بوو ، هەردوکیان کـــوڕی مالیك بوون ] ئوممورۆمان ـ رضي الله تعالی عنها ـ فەرمووی : قەسەم بە نووری دیدەم [ کە پێغەمەرە ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ] نازانم چیە ئەو طەعامە ئێستە سێ ئەوەندەی لە پێشوو زیاترە ، ئیمامی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالی عنه ـ [ لە دوای سوێندەکەی ] لێیخواردو فەرمووی : ئەو سوێندەم لــــــە شەیتانەوە بوە لە رقی شەیتان لوقمەیێکی لێ خوارد [ ئەم قسەی دواییە هی پێش خواردنی میوانەکانو زۆربوونی طەعامەکەیە ، مەعنای وا نیە کە لە دوای خواردنی میوانەکان حەزرەتی ئەبوبەکر لێیخوارد • تا موبایەنەتـی نەبێ لەگەڵ حەدیثەکەی پێشوودا ] لە دوای ئەمە کە هەموو تێریان خوارد حەزرەتی ئەبوبەکر بردیە خدمەت پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وســـلم ـ ـ ورضي الله تعالی عنه ـ لە خدمەت پێغەمەرا ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ تا سبەینێ مایەوە •

[ عەبدورەحمان ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەفەرموێ : ] لە بەینی ئێمەو قەومێکا موعاهەدەیێکمان بووبوو ، موددەتی رابوردبوو دوانـزە کەسمان جوێ کردەوە کردمان بە سەرکردە [ کە تەفەحوصی ئەحوالی دوشمنان بکەن] لەگەڵ هەر یەکێ لەو دوانزە کەسە گەلێ خەڵق بوو ، خـــوا ئەزانێ لەگەڵ

هەر یەکێکیان چەند کەس بوو هەموو خواردیان ، ئەوەندەی هەیە بـــەو دوانزە کەسەدا حیصصەی ئەوانی تری نارد •

زۆربوونی طەعامەکە لە ماڵی حەزرەتی ئەبوبەکرا موعجیزەی پێغەمەر بوو ـ صلی الله تعالـی علیه وسلم ـ بۆ حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالـی عنه ـ کەرامەت بوو • بەقییەکەی کە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ تەقسیمی کرد بەسەر لەشکرەکەدا کـــە کیفایەتی هەمووی کردن ، ئەوە صیرف موعجیزەی پێغەمەربوە ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ئـــەوەڵـی خاریقەکە لای حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالی عنه ـ ظوهووری کرد ، لە خدمەت پێغەمەرا ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ بە کەماڵ گەیی •

٥٦١/٢٣ ـ أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ يقول : قـــال أبو طلحة لأم سليم [ رضيالله تعالى عنهما ] : لقد سمعت صوت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ضعيفا أعرف فيه الجوع ، فهل عندك من شيء ؟ قالت : نعم ، فأخرجت أقراصا من شعير • ثم أخرجت خمـارا لهـا فلفت الخبز ببعضه ثم دسَّته [أخفته] تحت يـــدي [أي إبطـي] ولاثتنـي ببعضه [أي عصبته على رأسي] ثم أرسلتني إلى رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : فذهبت به فوجدت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليـه وسلم ـ في المسجد ومعه الناس ، فقمت عليهم فقال لي رسول الله ـصلى الله تعالى عليه وسلم ـ أأرسلك أبو طلحة ؟ فقلت : نعم • قال : بطعام ؟ فقلت : نعم • فقال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لمن معـه : قوموا • فانطلق وانطلقت بين أيديهم حتى جئت أبا طلحـة فـأخبرتـــه ، فقال أبو طلحة : يا أم سليم قد جاء رسول الله ـ صلى الله تعالى عليـــه وسلم ـ بالناس وليس عندنا ما نطعمهم • فقالت : الله ورسوله أعلم • فانطلق أبو طلحة حتى لقي رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فأقبل

رسول‌الله ـصلی‌الله‌تعالی‌علیه‌وسلم ـ وأبوطلحة معه، فقال رسول‌الله ـصلی‌الله تعالی‌علیه‌وسلم ـ: هلم یاأم‌سلیم ماعندك، فأتت‌بذلك‌الخبز، فأمر به‌رسول‌الله ـ صلی‌الله‌تعالی‌علیه‌وسلم ـ ففُتّ وعصرت أم سلیم عُكّة فأدَمَتْه، ثم قال رسول الله ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فیه ما شاء الله أن یقول ، ثـم قال : ائذن لعشرة ، فأذن لهم فأکلوا حتی شبعوا ثم خرجوا ، ثم قال : ائذن لعشرة فأذن لهم فأکلوا حتی شبعوا ثم خرجوا ، ثم قال : ائذن لعشـــرة فأذن لهم فأکلوا حتی شبعوا ثم خرجوا • ثم قال : ائذن لعشرة فأکـل القوم کلهم حتی شبعوا ، والقوم سبعون أو ثمانون =رجلا= ح-٦/٣٨، م ـ ٨/٣١١ ، ت ، ن ، ح ـ ٨/٢٠٣ •

**تەرجەمە :**

ئەنەسی بنی مالیك ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەفەرمویٚ : ئەبوطەلحە بە ئوممو سولەیمی فەرموو ـ رضي الله تعالی عنهما ـ دەنگی پێغەمەرم ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ بە زەعیفیی دی ، برسێتیی تیا حیس ئەکەم ، هیچت لا هەیە ؟ فەرمووی : بەڵێ ، چەند ئەستۆرکێکی جۆی دەرهێنا ، لە دواییا لەچکێکی خۆیی دەرهێنا نانەکەی لە بەعزێکیەوە پێچاو نایە بن باخەڵم ، ئەوی تریشی لە سەرمەوە پێچا ، لە دواییا ناردمی بـــۆ خدمەت پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ نانەکەم برد ، پێغەمەرم ـ صلی الله تعالـــی علیه وسلم ـ لە مزگەوت دەستکەوت ، خەڵقی لە خدمەتا بوو ، لە لایان راوەستام پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وســـلم ـ فەرمووی : ئەبوطەلحە ناردووتی ؟ وتم : بەڵێ • فەرمووی : طەعامی پیا ناردووی ؟ وتم : بەڵێ • پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وســـلم ـ بەوانەی کـــە لـــە خدمەتیا بوون فەرموو : هەڵسن پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ لەگەڵ ئەصحابیا تەشریفیان کەوتەرێو منیش لە پێشیانەوە رۆییم تا چوومە لای ئەبوطەلحـە

خەبەرم دایە کە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ لەگەڵ ئەصحابیـــا تەشریفیان هات ، ئەبوطەلحە فەرمووی : ئەی ئوممو ســـــولەیم پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ هەموو خەڵقی هێنا هیچمان نیە کە بەشـیان بکاو دەرخواردیان بدەین ، ئوممو ســـولەیم فەرمووی : خواو پێغەمەری خوا لە خەڵق چاتر ئەزانن • ئەبوطەلحە ـ رضي الله تعالی عنه ـ رۆیی تا بە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ گەیی ، پێغەمەر ـ صلی الله تعالـــی علیه وسلم ـ لەگەڵ ئەبوطەلحە تەشریفیان هات ، پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : یـــا ئوممو ســـولەیم چیـــت هەیـــە بیهێنە • ئوممو سولەیم ئەو نانەی هێنا ، پێغەمەر ـ صـــلی الله تعالی علیه وســـلم ـ ئەمری فەرموو نانەکەیان لەتلەتکردو ئوممو سولەیم ـ رضي الله تعـــالی عنها ـ هیزەڵۆکەیێکیان بوو گوشیی نانەکەی پێ چەور کرد ، لە دواییـــا فەرمووی : دە کەس ئیذن بدەن بێـــن ، ئیذندران هاتـــن تـــا تیربۆن خواردیان ، لە دواییا چوونەدەرەوە ، لە دواییا فەرمووی : ئیذنی دە کەس بدەن ئیذندران ، هاتنو تا تێر بوون خواردیانو چوونە دەرێ ، لە دواییا فەرمووی : ئیذنی دە کەس بدەن ئیذندرانو هاتن تا تێر بوون خواردیانو چوونەدەرێ • لە دواییا فەرمووی : ئیذنی دە کەس بدەن ، قەومەکە هەموو خواردیان تا تێر بوون ، قەومەکە حەفتا یا هەشتا =پیاو= بوون • راویەکە شکی بوە کە ئەنەس حەفتای فەرموە یا هەشتا •

موسلیم ـ رحمه الله ـ هەر لەم جێگەیەدا ئەم واقیعەیەی بـــە بەعزێ فەرق لە حەوت جێی تردا ذیکر کردوە ، تەنها تەرجەمەی فەرقەکانی نەقـڵ بکەم کافیە •

نەوەویی ئەفەرموێ : ( بلاشك ) ئەمە حادیثەیێکی ترە •

١ ـ ئەنەس ئەفەرموێ : ئەبوطەلحە طەعامی بۆ پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ دروستکردبوو ناردمی بانگی بکەم کە چووم پێغەمەر

ـ صلى الله تعالى عليه وسـلم ـ تەشریفی لەگەڵ خەڵقا بوو شەرمم لێ‌نیشت وتم : ( یا رســـول الله ) تەشریفت بێ ئەبوطەلحە بـانـگی کردووی ، پێغەمەر ـ صـلی الله تعالی علیه وســـلم ـ به ئەصحابی فەرموو : هەڵسن ، کە تەشریفیان چـــوو ئەبوطەلحە فەرمووی : ( یارسول الله ) شتێکی کەمم هەر بۆ تۆ کردوە ، پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ دەستی موبارەکی لێ‌داو دۆعای بەرەکەتی بۆ کردو فەرمووی : دە کەس بانگ بکەن • پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ شتێکی لـــە بەینی پەنجەی موبارەکیا بـــۆ دەرهێنا خواردیان تا تێر بوون‌و چوونەدەرێ • لە ئاخریدا ئەفەرموێ : کە هەموو تێریان خوارد تێی‌فکرین بە قەد پێشووی بوو •

٢ ـ ئەوەڵی وەکوو ئەوەڵی حەدیثە ئەوەڵەکەیە ، ئاخریەکەی ئەفەرموێ : ئەوی مابۆوەوە کۆیان‌کردەوە دۆعای بەرەکەتی بۆ کرد هەروەکوو بوو وای لێ‌هاتەوە ، فەرمووی : ئەوەیش بۆ ئێوە •

٣ ـ ئەبوطەلحە ئەمری کرد بە ئوممۆسولەیم ـ رضي الله تعالی عنهما ـ کە طەعامێ دروست بکا تەنها بۆ نەفسی پێغەمەر ـ صلی الله تعـالی علیه وسلم ـ ئەنەس ئەفەرموێ : ئەبوطەلحە ناردمی بە شـــــوێن پێغەمەرا ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ پێغەمەر ـ صلی الله تعالـــی علیه وسلم ـ دەستی موبارەکی نایە ناو طەعامەکەوەو ( بسم الله )ی بەسەرا کردو فەرمووی : ئیذنی دە کەس بدە فەرمووی : بخۆن‌و ( بسم الله ) بکەن ، خواردیان ، ئەو موعامەلەیەی فەرموو بە هەشتا کەس ، لە دواییا پێغەمـــــەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ خۆی خواردی‌و ئەهلی بەیت خواردیان‌و پاش‌ماوەیشیان لێ مایەوە •

٤ ـ ئەبوطەلحە ـ رضي الله تعالی عنه ـ لە بەردەرگاکەیانا وەستا تـــا

پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ تەشریفی هات ، ئەبوطەلحـە عەرزی کرد : ( یارســـول الله ) هە رشـــتێکی کەمە • پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : بیهێنە خوا بەرەکەتـــی تێ ئەخا •

٥ ـ لە دواییا پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ خواردیو ئەهـلی ماڵەکە خواردیانو ئەوەندەیش مایەوە کە ناردیان بۆ دراوسێ •

٦ ـ ئەبوطەلحە ـ رضي الله تعالی عنه ـ پێغەمەری ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ دی لە مزگەوت راکشابوو بەسەر زگو بەسەر پشتیا پێچی ئەخوارد ، هاتەوە لای ئوموسولەیم پێیوت ••

٧ ـ ئەنەس ئەفەرموێ : چوومە خدمەت پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ تەشریفی دانیشتبوو قسەی لەگەڵ ئەصحابیا ئەکرد زگی بە شتێ شەتەك دابوو ، لــە بەعزێ ئەصحابم پرسیی : بۆچی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیـــە وسلم ـ زگی وا توندبەستوە ؟ فەرموویان : لـــە بەر برسێتیی ! هاتمەوە بۆ ئەبوطەلحەم گێڕایەوە چۆوە لای دایکم پرسیی : هیچ هەیە ؟ =وتی= : بەعزێ پارچە نانو چەند خورمایێکمان هەیە ئەگەر پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ بە تەنها تەشریفی بێ تێـــری ئەکەین ، ئەگەر خەڵقی تری لە خدمەتا بێ کەمە ••

**موعجیزەیێ لـەم حەدیثانەدا هەیـە :**

١ ـ طەعامی یەکێ کیفایەتی هەشتا کەس بکاو بمێنێتەوە وەکوو بۆ دەرو دراوسێیشی لێ نێرراوە •

٢ ـ پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ لەگەڵ ئەمـــەدا خـەبەری

دراوەتێ بەکەمیی طەعامەکە عیلمی بوە کە ئەوەندە زۆر ئەبێ کـــە بەشی هەرچەندێ لە خدمەت خۆیا بیا ئەکا •

٣ ـ پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ زانیویەتی کە ئەبوطەلحـــە ئەنەسی ناردوە بۆیە لێیپرسیوە : کە ئەو ناردووتی ؟ گینا بۆچـــی هیچ جاری تر لێی نەپرسیوە •

٤ ـ پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ زانیویەتی کە ئەبوطەلحە شتی خواردنی بۆ ناردوە بە ئەنەسا بۆیە لێی پرسی •

٥ ـ لەو حەدیثەدا کە ئەبوطەلحە ناردوویەتی بە شوێن پێغەمەرا ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ کـــە تەشریفی ئەچێو بۆ ئەو دەکەس ـ دەکەسە شتێکی لە بەینی پەنجەی موبارەکی هێناوەتە دەرێ ، هێنانەدەرەوەی ئەو شتە کە خوا ئەزانێ چی بوە موعجیزەیە بەرەکەتی طەعامەکە لەو شتەوە بوە ( باذن الله )•

لەم حەدیثانەدا بەیانی قەناعەتو صەبرو زوهدو ئیبتیـلای پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ بە شەدائیدی تیاکراوە ، بەیانی حوسـنی خولقو تەواضوعیو چاوێریی ئەصحابی کیرامیانیشی تیا هەیـە • پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ بۆ ئەصحابو ئەصحاب بۆ پێغەمەر •

**ئەحکامی فیقهی ئـەم حەدیثانە :**

١ ـ ( بسم الله )کردن لەسەر طەعام •

٢ ـ کەتمی ئیحتیاجیی •

٣ ـ عەدەمی شەکوا لە وەقتی شیددەتا •

٤ ـ هەدیەناردن با کەمیش بێ •

٥ ـ دانیشتنی عالم لە مزگەوتا بۆ تەعلیمو تەعەللوم •

٦ ـ خانەخوێ لە پێش میوانەوە ڕۆیینەماڵەوەو خەبەربەماڵەوەدان •

٧ ـ ئیستیقبالی موسـافیر •

٨ ـ نانگوشینەناوشت •

٩ ـ لە وەختی شتخواردنا زۆر خۆتێنەخزانن بە نەوعێ زەحمەت بدا بە ڕەفیقەکانی تری •

١٠ـ نانخواردنی خانەخوێ لە دوای موسافیر •••سونتەتن •

لە فەرموونی ئومموسولەیم ( الله ورسوله أعلم ) کیاسەتو عیـلمو عەقڵی ئومموسولەیم ئیستیفادە ئەکرێ ـ رضي الله تعالى عنها ـ •

٢٤/٥٦٢ ـ عن أبي هريرة أو عن أبي سعيد [رضي الله تعالى عنهمـا] شك الأعمش • قال : لما كان يوم غزوة تبوك أصاب الناس مجاعة فقالوا : يا رسول الله لو أذنت لنا فنحرنا نواضحنا فأكلنا وادّهنا ، فقال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : افعلوا • قال : فـجاء عمـر [رضي الله تعالى عنه] فقال : يارسول الله إن فعلت قل الظهر ، ولكن ادعهم بفضـل أزوادهم ، ثم ادع الله لهم عليها بالبركة لعل الله ان يجعل في ذلك • فقال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : نعم • قال : فدعا بنطع [ فيه أربع لغات مشـــهورة على الترتيب : نِطَــع ، نَطَع ، نَطْع ، نِطْع ] فبسـطه ثم دعا بفضل أزوادهم ، قال : فجعل الرجل يجيء بكف ذرة ، قال: ويجيء الآخر بكف تمر ، قال : ويجيء الآخر بكِسْرة حتى اجتمع عـلى النطع من ذلك شيء يسير قال : فدعا رسول الله ـ صلى الله تعالى عليـه وسلم ـ بالبركة ، ثم قال لهم : خذوا في أوعيتكم • قال : فأخذوا فـي أوعيتهم حتى ماتركوا في العسكر وعـاء إلا ملأوه • قال : فأكلوا حتى شبعوا وفضلت فضلة • فقال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسـلم : أشهد أن لا إلـه إلا الله وأني رسول الله ، لا يلقى اللهَ بهما عبد غير شـاك

فيحجب عن الجنة م ـ ١/٣٠٣ ، م ـ ١/٣٠٠ وفيـه : قـــال مجاهــد : وذو النواة بنواة • قلت : وماكانوا يصنعون بالنواة ؟ قال : كانوا يمصونها ويشربون عليها الماء • ح ـ ٥/١٢٦ وفيه : فلقيهم عمر [رضي الله تعـالى عنه] فأخبروه ، فقال : ما بقاؤكم بعد إبلكم ؟ فدخل عمر على النبي ـصلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقال : يارسول الله ما بقاؤهم بعد إبلهم ؟ قـــال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : ناد في الناس يأتون بفضـل أزوادهم فدعا وبرّك عليه ، ثم دعاهم بأوعيتهم فاحتثى الناس حتى فرغوا [من حاجاتهم] ثم قال رسول الله : أشهد أن لاإله إلا الله وأني رسول الله•

**تەرجەمە :**

ئەبوهورەیرە ، یا ئەبوسەعید لە ریوایەتەکەی ترا ئەبوهورەبرە ،بە بێ شك ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ، ئەفەرموێ : لە غەزای تەبووکا خـەڵق گرفتاری برسێتیی بوون فەرموویان : ( یا رســـــول الله ) ئەگەر ئیـذن بفەرمووی لە وشترەکانمان سەربڕبڕیایە ئەمانخواردو خۆمان پێ ئەهەنووە• پێغـەمـەر ـ صلى الله تعـالى علیـه وســـلم ـ فـەرمووی : بیکـەن • ئیمامی عومەر ـ رضـي الله تعـالى عنـه ـ تەشـریـفی هـاتـە خـدمـەت پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : ( یا رســـول الله ) ئەگەر ئەوە بکەی حەیوانی سواریی کەم ئەبێ (لکن) بانگیان بکە کـە فەضلەی تێشوویان چی ماوە بیهێنن دۆعای بەرەکەتیان بۆ بەسەرا بخوێنە بەڵکە خوا لەوەدا شتێك بکا پێغەمەر ـ صلى الله تـــعالى علیـــه وسلم ـ فەرمووی : بەڵێ ئەیکەم ، ئەمری فەرموو کەوڵێکیان هێنا رایانخست ، لە دواییا فەرمووی : کێ شتێکی فەضلەی هەیە بیهێنێ • پیـاوێ مستێ زەڕاتی هێنا ، یەکێکی تر مستێ خورمای هێنا ، یەکێکی تر پارچەیـێ نانی هێنا تا لەسەر کەوڵەکە شتێکی کەم کۆبوەوە ، پێغەمەر ـ صلى الله

تعالى عليه وسلم ـ دۆعای بـەرەکەتی بۆ خوێن لـە پاشا پێی‌فەرموون : بکەنە ناو زەرفتانەوە ، دەستیان پێکرد تا لە ناو عەسکەرەکەدا هیچ زەرفێ نەمایەوە کە پڕی نەکەن ، تا تێر بوون خواردیانو فەضلەیشی مـایـەوە • پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : ( أشـهد أن لا إله إلا الله وأني رسول الله ) هیچ کەسێ نیە کە لەگەڵ ئەم دوو کەلیمەدا بە بێ شك مولاقاتی حوضووری خوای ببێتو لە بەهەشت مەنع بکرێ [منیش بێ‌شك ئەڵێم ( أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا عبده ورسوله]•

لە ریوایەتەکەی تری موسلیما ئەفەرموێ : موجاهید وتی : ئەوەی دەنکەخورمای بوو دەنکە خورمای خۆی هێنا • راویـی ئـەڵێ : بـــە موجاهیدم وت : دەنکەخورمایان چی لێ ئەکـــرد ؟ وتـی : ئەیانمژیو ئاویان بەسەرا ئەخواردەوە • ( رضي الله تعـــالى عنهـــم ماأقنعهـم ومـا أصبرهـم ! ) •

لە حەدیثەکەی بوخاریدا ئەفەرموێ : ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ بەوانە گەیی کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وســلم ـ ئیذنی دابوون کە وشتر ســـەربڕن خـــەبەریان داپێ فەرمووی : لـــە دوای وشترەکانتان کە سەرتان‌بڕین ئێوە چەندە ئەمێنن ؟ یەعنی چـەنـد رۆژێ بەوە ئیدارە ئەکەن ؟ کە بڕایەوە دووبارە برسیتان ئەبێتەوەو هیچ نـابێ بیخۆن ، وشتر نامێنێ سەری ببڕن دووبارە بە هیلاکا ئەچن ، تەشریفـی چۆوە خدمەت پێغەمەر ـ صلى الله تـــعالى عليـه وسلم ـ عەرزی‌کرد : ( يا رسول الله ) ماندەوەی ئەصحاب لە دوای سەربڕینی وشترەکانیـان چیە ؟ پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : بە ناو خەڵقـا بانگ بکە کە فەضلەی طەعامیان چیە بی‌هێنن ، هێنایانو پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ دۆعای بەرەکەتی بەسەرا خوێندو بـانگی‌کردن ،

زەرفەکانیان هێناو تێیانمالی تا هەر کەس بەقەد ئیحتیاجیی زەرفی خۆیی لێ پڕکردو ئیحتیاجیی نەما • پێغەمەر ـ صلی اللە تعالی علیـه وســـــلم ـ فەرمووی ( أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أني رسول الله )•

موعجیزەی : زۆربوونی طەعامی کەمە •

حوکمی : لە حینی حاجەتا ئیلتیجا بەگەورەبردن •

گەورە ئەمرێکی کرد (مەعییەت)[1] خیلافی ئەوەی بـە مەصلەحەت زانی ئەبێ عەرزی گەورەکەی بکا ، گەورەکەیشی موافیقی مەصلەحەتـی دی بە قسەی بکا •

ظوهووری موعجیزە صیدقی ریسالەتی پێ بە قووەتتر ئەبێ ، بۆیـە پێغەمەر ـ صلی اللە تعالی علیە وسلم ـ کەلیمەی شەهادەتی هێناوە •

بـە یەقینیی کەسێ کەلیمەی شەهادەت بێنێ بــە بێشك ئـەچێتـە بەهەشتەوە ، گوناهی تری ببێ ئەوە لە مەشییەتی خوادایە وەك لە ئیمانـا بەحثی لێ کـرا •

گەورەیی‌و فەضلی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ •

تێکەڵکردنی طەعام‌و رزق مووجیبی بەرەکەتە •

وفي م ـ ٣٠٦/٧ عن سلمة بن الأكوع نحوه وفيه : قال [ ســـلمـة ـ رضي الله تعالى عنه ـ] : فتطاولت لأحزره فحزرته كَرَ بَض العنز ونحن أربع عشرة مائة ، قال : فأكلنا حتى شبعنا جميعا ، ثم حشونا جُرُبنا • وفيه تكثير الماء وقد مر في حديث آخر في تكثير الماء •

**تەرجەمە :**

سەلەمە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : خۆم بۆ درێژکردەوە

---

(١) واتە یارانی‌و ئەوانەی کە لەگەڵیان .

کە تەخمینی بکەم ، تەخمینمکرد بە قەد ئەوە بوو کە مەڕێ مۆڵ بخوا،[1] ئێمە هەزارو چوارصەد کەس بووین ، خواردمان تا هەموو تێر بووین ، لە دواییا هەرچی توورەکەیێکمان پێبوو پڕمان کردو ئاخنیمان •

٢٥/٥٦٣ ــ عن أنس [بن مالك ــ رضي الله تعالى عنه ــ يقول : كان النبي ــ صلى الله تعالى عليه وسلم ــ إذا مرَّ بِجَنَبات أم سليم دخل عليها فسلم عليها • ثم قال : كان النبي ــ صلى الله تعالى عليه وسلم ــ عروساً بزينب ــ رضي الله تعالى عنها ــ فقالت لي أم سليم : لو أهدينا لرسول الله ــ صلى الله تعالى عليه وسلم ــ هدية ! فقلت لـها : افعلي • فعمدت إلى تمر ، وسمن ، وأقط ، فاتخذت حيسة في برمـة ••• إلخ ح ــ ٦/٦٥ ]. قال : تزوج رسول الله ــ صلى الله تعالى عليه وسلم ــ فدخل بأهله [ زينب بنت جحش ــ رضي الله تعالى عنها ــ] قال : فصنعت أمي أم ســـــليم حَيْساً [تمرا ، سمنا ، أقطا] فجعلته في تَوْرٍ ، فقالت : يا أنس اذهب بهذا إلى رسول الله ــ صلى الله تعالى عليه وسلم ــ فقل بعثَتْ بهذا إليك أمي وهي تقرئك السلام وتقول : إن هذا لك منا قليل يارسول الله• قال : فذهبت بها إلى رسول الله ــ صلى الله تعالى عليه وسلم ــ فقلت : إن امي تقرئك الســـلام وتقـــول : إن هذا لك منا قليـــل يا رســـول الله فقـــال : ضـــعه • ثم قـــال : اذهب فادع لي فـــلانا وفلانـــا وفلانـــا ، ومن لقيت ، وســـمى رجالا • قال : فدعوت من سمى ومن لقيت • قال [ الجعـــد أبو عثـــمان ] : قلت لأنس : عدَدَكَمْ كانوا ؟ قـــال : زهـــاء ثلاثمائـــة • وقـــال لي رســـول الله ــ صلى الله تعـــالى عليـــه وســـلم ــ : يا أنس هات التَّوْر • قال : فدخلوا حتى امتلأت الصفة والحجرة [فرأيت النبي ــ صلى الله تعالى عليه وسلم ــ وضع يديه على تلك الحَيْسة، وتكلم

(١) ئەگەر لە باتی ئەمە بیفەرمواية : « بـــە قەد پەچە رانێ ئەبوو » باشتر ئـــەبـــوو •

بها ماشاء الله ، ثم جعل يدعو عشرة ـ عشرة يأكلون منه ، ويقول لهـم : اذكروا اسم الله وليأكلْ كلُّ رجل مما يليه ح ـ ٨/٦٥] فقال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : ليتحلق عشرة ـ عشرة وليأكل كل إنسان مما يليه . قال : فأكلوا حتى شبعوا ، قال : فخرجت طائفة ودخلت طائفة حتى أكلوا كلهم ! فقال لي : يا أنس ارفع ، قال : فرفعت ، فما أدرى حين وضعت كان أكثر أم حين رفعت . قال : وجلس طوائف منهم يتحدثون في بيت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ورسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ جالس وزوجته مولّية وجهها إلى الحائط فثقّلوا على رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فخرج رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فسلم على نسائه ثم رجع ، فلما رأوا رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قد رجع ظنوا أنهم قد ثقّلوا عليــه ، قـال : فابتدروا الباب فخرجوا كلهم ، وجاء رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ حتى أرخى الستر ودخل وأنا جالس في الحجرة ، فلم يلبث إلا يسيرا حتى خرج علي وأنزلت هذه الآية . فخرج رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسـلم ـ وقرأهن على الناس : (يا أيها الذين آمنوا لا تدخلوا بيوت النبي ، إلا أن يؤذن لكم إلى طعام ، غير ناظرين إناه ، ولكن إذا دعيتم فادخلوا ، فـإذا طعمتم فانتشروا ، ولا مستأنسين لحديث إن ذلكم كـان يؤذي النبي ... إلى آخر الآية [ تمامها : فيستحي منكم والله لا يستحي من الحق ، وإذا سألتموهن متاعا فاسألوهن من وراء حجاب ، ذلكم أطهر لقلوبكم وقلوبهن، وما كان لكم أن تؤذوا رسول الله ، ولا أن تنكحوا أزواجـه من بعـده أبدا ، إن ذلكم كان عند الله عظيما)][1] قال الجعد : قال أنس بن مالك [رضي الله تعالى عنه] : أنا أحدَثُ الناس عهدا بهـذه الآيـات ، وحجبن

---

(١) الاحـــزاب / ٥٣ .

نساء النبي - صلى الله تعالى عليه وسـلم - م - ٦/١٨٧ ، ح - ٨/٦٥ بأخصَر ، ونقلت منه مافيه من الزيادة •ت في التفسير •

**تەرجەمە :**

ئەنەسی بنی مالیك ـ رضـــي الله تعالى عنـــه ـ فەرمووی : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەزەووجی کرد [ لەگەڵ زەینەبی کچـــی جەحشا ] تەشریفی چوە لای حەرەمی تازەی ، دایکم خورماورۆتێکی کرد، کردیە ناو تەبەقێکەوە پێی‌وتم : ئەی ئەنەس ئەمە بە بۆ خدمەت پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ عەرزی‌بکە : دایکم ئەمەی ناردە خدمەتت سەلامت لێ ئەکا ئەڵێ : ئەمە لە ئێمەوە بۆ تۆ کەمە ( یارسول الله ) ئەنەس فەرمووی : بردمە خدمەت پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ عەرزم کرد : دایکم سەلامت لێ ئەکا ئەڵێ : ئەمە بۆ تۆ کەمە لە طەرەفی ئێمەوە ( یارسول الله ) فەرمووی : دایێ ، لە دواییا فەرمـــووی : بچۆ فلاٌنو فلاٌنو فلاٌن بانگ کە ، بەهەر پیاوێ گەییت بانگی کە ، چەند پیاوێکی ناوبرد• ئەنەس فەرمووی : ئەوی ناوی بردو ئەوی پێی‌گەییم بانگم کردن [ جەعدی راویی ] ئەڵێ : بە ئەنەسم وت : کە چەند بوون ؟ فەرمووی : نزیـــــکی سێصەد کەس • پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : ئـەی ئەنەس تەبـەقەکە بێنـە [ پێغەمەرم دی ـ صلى الله تعـالى عليـه وسـلم ـ هەردوو دەستی موبارەکی نایە سەر خورماورۆنەکە ، ئەوەندەی خوا حەز بکا دۆعای بەرەکەتی بەسەرا خوێند ] ئەوانی بانگ‌کرابوون هاتنە ژووریٚ تا هەیوانو حوجرەکە پڕبوون ، پێغەمەر ـ صـــلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : دە ـدە حەلقە ببەستن [ بسم الله بکەن ] هەرکەس لە بەردەمی خۆیەوە بخوا [ ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] فەرمووی : ئەو دەستـە تا تێربوون خواردیان [ بـەم نەوعە طائیفەیـــێ چوونـــەدەرێو طائیفەیێ

هاتنەژووریّ تا هەموو تێربوون ] پێغەمەر ـ صلى الله تعالى علیه وسلم ـ فەرمووی : ئەی ئەنەس هەڵی بگرە ، هەڵم‌گرت نازانم کە دامنا زۆرتـــر بوو یا کە هەڵم‌گرت زۆرتر بوو • فەرمووی : بەعزیّ کەس دانیشـتین بۆ قسەکردن لە ماڵی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى علیه وسلم ـ تەشـــریفی دانیشتبوو حەرەمی تازەیشـــی رووی وەرگێـــڕابوە دیوارەکەوە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى علیه وسلم ـ ئیستیثقالی[1] کردن تەشریفی چوو ســەلامی لە ئەزواجی طاهیراتی کرد [ ئەوانیش موبارەکبایی‌یان لیّ‌کرد ] لە دوایـــا تەشریفی گەڕایەوە کە چاویان پیّ‌کەوت کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى علیه وسلم ـ تەشریفی گەڕایەوە تیّ‌گەیین کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى علیـــه وسلم ـ ئیستیثقالی کردوون بە عەجەلە روویان‌کردە دەرگاکەوەو هەمـــوو چوونە دەریّ ، پێغەمەر ـ صلى الله تعالى علیه وسلم ـ تەشریفی هـــاتو پەردەکەی دادایەوە تەشریفی چوە ژووریّو من لە حوجرەکەدا دانیشتبووم ، ئەوەندەی پیّ نەچوو پێغەمەر ـ صلى الله تعالى علیه وسلم ـ تەشـــــریفی هاتەدەریّ ئەم ئایەتەی [ سوورەتی ئەحزابی ] نازڵ‌کرابوە سەر ، پێغەمەر ـ صلى الله تعالى علیه وسلم ـ تەشریفی چوە دەریّو بۆ خەڵقی خوێندەوە، ئایەتەکە ئەمەیە مەعنای وایە :

ئەی ئەوانەی کە ئیمانتان هێناوە مەچنە ناو ماڵەکانی پێغەمەر مەگەرەکی ئیذن بدریّن بۆ طەعام [ ئەویش بەو شەرتە ] کە چاوەنوارِکیّ نەکەن کـــە کوڵاو نزیکی خواردنی بوو خۆتان رابنوێنن کە بانگ‌بکریّن ، ئەمما کـــە بانگ‌کران بچن کە خواردتان بڵاوەی لیّ‌بکەن [ یەعنی بیّ ئەمە کە بانگ بکریّن لە خۆتانەوە بە طوفەیلێتی هوجووم مەکەنە سەر ماڵان بۆ نان‌خواردن مەگەر بانگ‌بکریّن ، ئەو وەختە بچن • ئەو وەختەیش کـــە بانگ‌کرانو

---

(١) واتە دانیشتنەکەیانی پیّ گران بوو •

چوون =کە= نانتان خوارد بلاوەی لێ بکەن ] بەند مەبن بۆ خاتری ئەمە کە لەگەڵ یەکتری قسە بکەنو [ بەوە وەقت رابوێرن ] ئەو دوو حاڵـەتـان [ یەعنی لە وەختی نانخواردنا بە بێ دەعوەت هوجوومکردنە سەر ماڵاتتان ، کە دەعوەتیش کران لە دوای نانخواردن مانەوەتان بۆ قسەکردن ] ئەذیەتی پێغەمەر ئەدا حەیاتان لێ ئەکا کە دەرتان بـــکا [ ئـــەو وەختە دەرکردنتان شتێکی باشە ، نابێ حەیا بکرێ لە کردنی ] •

خوا ـ عز وجل ـ لە شتێك کـە حـەق بـــێ لـە خەڵـق ناتەکێتەوە ئەیفەرموو : کـە لـە ئەزواجی طاهیـــرات مەتاعێکتان لـــێ طەڵەبکردن مەچنە ناو ماڵەکەیانەوە ، لە پشت پەردەوە داوایان لێ بکەن ، بەم نەوعـە موعامەلەکردنتان پاکترە بۆ دڵی ئێوەو بۆ دڵی ئەوانیش [هەردوو لا لـــە سووئی ظەن دوورەبن ] بۆ ئێوەیش دروست نیە کە ئەذیەتی رەسوولوڵلا بدەن ، بە ئەبەدیش بۆتان دروست نیە کە لە دوای ئەو حەرەمەکانی مارە بکەن ، گوناهی ئەوە لە لای خوا زۆر گەورەیە •

[ إناه : إدراكه • أني يأني أناةً [ فهو آنٍ • أبو ذر ] بوخـاریی ( غير ناظري ) چاوەنوارِی وەختی پێگەیینی چێشتی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ مەکەن هەر کە زانیتان هوجووم بکەنەسەری ] •

**موعجیزەی :**

جەعد ئەڵێ : ئەنەس فەرمووی : من تازەعەهدترم بەم ئایەتانە [یەعنی هەر کە نازڵ بوو دەزبەجێ بە تازەیی لە دەمی موبارەکی پێغەمەرم ـصلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەلەققی کرد ] ئەزواجی پێغەمەر ـ صلى الله تعـالى عليه وسلم ـ خرانە حیجابەوە •

موعجیزەی : خورماوڕۆنێ لە ناو تەبەقێکا ئەنەس ـ رضي الله تعالی عنە ـ کە ئەو وەختە منااڵ بوە بتوانێ هەڵیبگرێ بەشی سێصەد کەسی کردوە ! ئەوەی سەیرە کە هیچی لێ کەم نەبۆتەوە ! ئـەوە بە غـەیری قودرەتی قاعیرە بە کێ ئەکرێ ؟ بە ذەرەبین شتی زۆر بچوك زۆر گەورە ببینرێ ئەمما لە حەقیقەتا گەورە ئەبێ ؟ خەیر ٠ بە ذەرەبین یا بە هەموو وەسائیطی ئەوروپا سێصەد برسیی تێر ئەکرێ ؟ رووی ئەوانە رەش بێ کە لەم دینە پاكو تەمیزە وەرئەگەڕێنو وەرگەڕاون !

**حـوکـمی :**

هەدییەناردن بۆ تازەبووكو زاوا سوننەتە ٠

تەبریککردنیان سوننەتە ٠

چێشتلێنان بۆ شایی سوننەتە ٠

دەعوەتی خەڵق بۆ نانی شایی سوننەتە ٠

ئیجابەتی دەعوەتی شایی واجبە ٠

ئیعتیذاری ئەو کەسەی کە شتی کەم بنێرێ بۆ گـەورە ٠٠ لـە حوسنی ئەخلاقـە ٠

قەبوولکردنی هەدییە سوننەتە ٠

طوفەیلێتیی حەرامـە ٠

میوانیی یەك ساعەتی دوای نانخواردن چوونەدەروەی لازمـە ٠ مانەوەی مەکرووهە ٠

لەسەر نانخواردن (بسم الله)کردن سوننەتە ٠

لە بەردەمی خۆیەوە خواردن لە ئادابی خواردنە ٠ خیـلافی لـە کەراهەتەوە تا حەرامیی بەدەمەوەیە ٠

تێرخواردن دروستە ٠

تێکەڵبوونی ژنو پیاوی نامەحرەم حەرامە ٠

کەسێ ژن بە سەر ژن بهێنێ بەجێهێنانی دڵی ئەوەی کە ژنی بەسەر هێنراوەو دڵخۆشیدانەوەی سوننەتی موئەککەدەیە •

بە دەعوەتی عامە بۆ هەموو کەس دروستە بچێتە سەر ئەو دەعوەتە ـا بـە خوصووصیش بانگ نەکرێ •

٥٦٤/٢٦ ـ عن عبدالرحمن بن أبي بكر ـ رضي الله تعـالى عنهما ـ قال : كنا مع النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ثلاثين ومائة ، فقال النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : هل مع أحد منكم طعام" ؟ فإذا مع رجل منهم صاع من طعـام أو نحوه ، فعجن ، ثم جـاء رجل مُشرِك مُشـعانٍ [ثائر الرأس متفرقه] طويل بغنم يسوقها ، فقال النبي ـصلى الله تعالىعليهاـ: بيعا أم عَطيَّة ، أو قال أم هبة ؟ قال : لا بل بيع" • فاشترى منه شــاة فصنعت ، وأمر النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بســواد البطن [ أي كبدها أو كل مافي بطنها ] ان يشوى ، وأيم الله ما في الثلاثين والمـائــة إلا وقد حزّ النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ له حُزَّة من سواد بطنها، إن كان شاهدا أعطاها إياه ، وإن كان غائبا خبأ له فجعـل منـها قصعتين ؛ فأكلوا أجمعون وشبعنا ، ففضلت القصعتان ، فحملناه على البعير أو كما قال [عبدالرحمن] ح ـ ٣٤٨/٤ ، ٩٦ مختصرا •م ـ ٣٤١/٨ •

**تەرجەمە :**

عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : صەدو سی کەس بووین لە خدمەت پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : لای هیچ کامێکتان خۆراك هەیە ؟ لای پیاوێ میقداری مەنێ طەعام بوو ، شێلرا ، لە دواییا پیاوێکی موشریکی درێژی سەرو قژ ئاڵۆزاو هات مەڕی پێ بوو • پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : فرۆتەنییە ، یا

عەطییەیە ؟ یاخۆ فەرمووی : یا هیبەیە ؟ [راویی بە شككەوتوە لەم دوو لەفظەدا ] موشریكەكە وتی : خەیر بەڵكو فرۆتەنییە • پێغـەمـەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ مەڕێكی لێ كڕی ، سەربڕرا پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ئەمری =كرد= كە ناوسكەكەی ببرژێنن • عـەبدوڕەحمـان ئەفەرموێ : وەڵلاهی هیچ كەس نەبوو لەو صەدو سی كەسە پێغـــەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ لە ناوســـكەكەی پارچەیێكی بۆ =لـێ= نەكاتەوە • ئەگەر حازر بووبێ تەسلیمی كردوە ، ئەگەر حازر نەبووبـێ بۆی هەڵگرتوە ، لە مەڕەكە دوو لەگەن چێشتی لێ كرا ، هەموو خواردیان، تێرمان خوارد ، دوو لەگەنەكە فەضلە مایەوە خستمانە سەر وشتر [یەعنی بۆ وەقتێكی تر ] یاخۆ وەكوو عەبدوڕەحمان كە فەرموویەتی وای فەرموو •

لە سیوجگەر یا هەموو ناوسكی حەیوانێ بەشی صەدوسی كــەس دراوە ! صەدو ســی كــەس بـــە مەنێ جۆو گۆشتی مەڕێ تێربوونو ئەوەندەیشیان لێ ماوەتەوە كە بخرێتە سەر باری وشترێ !

دروستە هەدییە لە موشریك قەبووڵ بكرێ •

دروستە موعامەلەی لەگەڵ بكرێ •

دروستە فەضلەی رزق بە ئیحتیاط ئیددیخار بكرێ بۆ وەقتی حاجەت مونافیی تەوەككول نیە •

بەسەرگرتنەوەی رەفیقو موراعاتی حەقی سونەتە •

أحادیث ناضح جـابر ـ رضي الله تعالى عنه ـ كلها حادثـة واحدة . ذكرها البخاري في أكثر من عشرين موضعا ولكلٍّ ترجم بابا غير البـاب الأول فما أغزر ـ رحمه الله تعالى ـ فقهه وأنا أنقل بعضها[1].

---

(١) حەدیثەكانی وشترەكەی جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ یەك رووداوە، بوخاریی لە زیاتر لە بیست جێگەدا باسی كردوەو بابی سەربەخۆی بۆ داناوە . ماشەڵلا لە زانیارییو شەرعزانی بوخـاریی ـخ ـ من لێرەدا هەندێكیان ئەنووسم .

٥٦٥/٢٧ ـ أبو المتوكل الناجي ، قال : أتيت جابر بن عبدالله الأنصاري [رضي الله تعالى عنهما] فقلت له : حدثني بما سمعت من رسول الله ـصلى الله تعالى عليه وسلم ـ • قال : سافرت معه في بعض أسفاره ، قال : أبو عقيل [أحد الرواة من ابن المتوكل] : لا أدري غزوة أو عمرة فلما أن أقبلنا قال النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ: من أحب أن يتعجل إلى أهله فليَعَجِّلْ ، قال جابر : فأقبلنا وأنا على جمل أَرْمك [ يخالط حمرته سواد" ] ليس فيه شية والناس خلفي ، فبينا أنا كذلك إذ قام عليَّ فقال لي النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ: ياجابر استمسك ، فضربه بسوطه، فوثب البعير مكانه [ولأحمد : قلت : يارسول الله أبطأ جملي هذا • قال: أنِخه وأناخ رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ثم قال : أعطني هذه العصا ففعلت ، فأخذها فنخسه بها نخسات ، ثم قال : اركب ، فركبت ] فقال : أتبيع الجمل ؟ قلت : نعم • فلما قدمنا المدينة ودخل النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ المسجد في طوائف أصحابه فدخلت إليه وعقلت الجمل في ناحية البَلاط [الحجارة المفروشة عند باب المسجد ] فقلت له : هذا جملك =فخرج= فجعل يطيف بالجمل ، ويقول : الجمل جملنا، فبعث النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ أواقٍ من ذهب ، فقال : أعطوها جابرا ، ثم قال : استوفيتَ الثمنَ ؟ قلت : نعم • قال : الثمن والجمل لك ح ـ ٥/٧٢ ، م ـ ٧/٣٤ مختصرا •

**تەرجەمە :**

ئەبولموتەوەکیلی ناجیی ئەفەرموێ : چوومە خدمەت جابیری کوڕی عەبدوڵلای ئەنصاریی ـ رضي الله تعالى عنهما ـ وتم : قسەیێکم بۆ بکە کە لە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ت بیستبێ ، یەعنی یا دیبێتت ، فەرمووی : لە بەعزێ سەفەری پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه

وسلم ـ سەفەرم لە خدمەتیا کرد • ئەبوعەقیلی راویی ئەڵێ : نازانم کـــە ئەبولوتەوەکیل غەزای وت یا عومرەی وت [ لە بەعزێ ریوایەتا غەزای تەبووك ، لە بەعزێ ریوایەتا غەزای (ذات الرقاع)] کە لـــەو ســـەرەوە گەڕاینەوە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : کێ حەزەکا زوو بە ماڵو منالی بگاتەوە عەجەلە بکا ، جابیر فەرمووی : رۆیین سواری وشترێکی سووربۆر بووم ، هیچ رەنگێکی تری تێکەڵ نەبوو ، خەڵقیش لە دوامەوە بوو ، لەو وەختانەدا کە بە عەجەلە ئەڕۆیین ئەوەندەم زانیـی وشترەکەم وەستا ، پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : یـا جابیر خۆت قایم بگرە ، کە بە قەمچییەکەی قەمچیێکی پیاکێشا وشترەکـە لە جێی خۆی بازرەقەی بەست [ لە حەدیثی ئیمامی ئەحمەدا ئـەفەرموێ : وتم : (یارسول‌الله) وشترەکەم لە رۆیینا سستیی ئەکا ، فەرمووی : بیخی دە، پێغەمەریش ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ وشترەکەی خۆی بیخدا ، ئەمجا فەرمووی : ئەو عەصایەم بدەرێ ، دامێو وەری گرت ، بە عەصاکە چەند دەفعەیێکی تێوەژەن ، لە دوایبا فەرمووی : سواربە • سواربووم ]•

فەرمووی : وشترەکەت ئەفرۆشی ؟ وتم : بەڵێ • کە گەیینە مەدینەو پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ لەگەڵ چەند طائیفەیێ لە ئەصحابی تەشریفیان چوە ناو مزگەوتەکەوە منیش چوومە ژوورەوە خـدمـەتـی ، وشترەکەم لە گۆشەیێکی وشکەسییەکەی بەردەمی دەرگای مزگەوتەکەدا ئەشکێڵ کرد ، عەرزم‌کرد : ئەمە وشترەکەت • تەشریفی هاتەدەرێ لـــە وشترەکەوە نزیك ئەبۆوەو ئەیفەرموو : وشتر وشتری ئێمەیە • لە دوایبا پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیـه وســلم ـ چەند ئووقیەیێ ئاڵتوونی نارد فەرمووی : بیدەن بە جابیر ، لە دوایبا فەرمووی : قیمەتی وشترەکـەت وەرگرت بە تەواویی ؟ وتم : بەڵێ • فەرمووی : قیمەتی وشـــترەکـــەو وشترەکەیش هیبەی تۆبێ •

٥٦٦/٢٨ ـ وعنه قال : غزوت [ذات الرقاع ، طبقات ابن سعد • في تبوك ، خ• فتح ، مسلم ] مع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسـلم ـ قال : فتلاحق بي النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وأنا على ناضح لنا قد أعيى فلا يكاد يسير • فقال لي : ما لبعيرك ؟ قال : قلت : عيِيَ • قال : فتخلف رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فزجره ودعا لـــه [ ولمسلم وأحمد فضربه برجله ودعا له • وليونس : فضربه رســـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ودعا له فمشى مِشيةً ماشى قبل ذلـك مثلها ] فمازال بين يدي الإبل قدامها يسير ، فـقال لي [عليـه الصـــلاة والسلام] : كيف ترى بعيرك ؟ قال : قلت بخير قد أصابته بركتك• قال: أفتبيعنيه ؟ = قال : فاستحييت= ولم يكن لنا ناضح غيره • قال : فقلت : نعم • قال : فبعنيه [بأوقية • أخرى •خ] فبعته إياه على أن لي فَقار ظهره حتى أبلغ المدينة [وعند النسائي : أخذته بكذا ، وأعرتك ظهره إلى المدينة ] قال: فقلت : يارسول الله إني عروس ، فاستأذنته ، فأذن لي ، فتقدمت الناس إلى المدينة حتى أتيت المدينة ، فلقيني خالي [ ثعلبة بن غنمة ، وله خال آخر عمرو بن غنمة ] فسألني عن البعير ، فأخبرته بما صنعت ، فلامني• قال : وقد كان رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال لي حين استأذنته: هل تزوجت بكرا أم ثيبا ؟ فقلت : تزوجت ثيبا [سهيلة بنت معوز الأوسية] فقال : هلا تزوجت بكرا تلاعبها وتلاعبك • فقلت : يارســـول الله تـوفي والدي ، أو استشهد ولي أخوات فكرهت أن أتزوج مثلهن ، فلا تؤدبهن ولا تقوم عليهن ، فتزوجت ثيبا لتقوم عليهن وتؤدِّبهن ، قال : فلما قدم رسول الله ـ صلى الله تعالى عليـه وســـلم ـ المدينة غدوت عليه بالبعير فأعطاني ثمنه وردَّه عليَّ • قال المغيرة [بن المقسم] : هذا في قضائنا حسن لا نرى به بأسا ح ـ ١١٩/٥ ، م ـ ٣١/٧ ، د ، ت ، ن •

وفي ح ـ ٤/١٥٥ مثله وفي آخره : فلما قدمنا المدينة قال : يا بلال اقضه وزده ؛ فأعطاه أربعة دنانير وزاده قيراطا • قال جابر : لا تفارقني زيادة رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ [قال عطاء] : فلم يكن القيراط يفارق جراب جابر بن عبدالله ـ رضي الله تعالى عنهما ـ وفي آخر ح ـ ٤/٣٤٢ : فما زال منها شيء حتى أصابها أهل الشام يوم الحرة •

وفي ح ـ ٤/٢١٨ : فأخبرت خالي ببيع الجمل فلامني ، فأخبرته بإعياء الجمل وبالذي كان من النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ووكزه إياه، فلما قدم النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ غدوت إليه بالجمل فأعطاني ثمن الجمل والجمل وسهمي مع القوم •

وفي م ـ ٧/٣٣ : ثم قال لي : بعني جملك =هذا= قال : قلت : لا بل هو لك • قال : لا بل بعنيه • قال : قلت : لا بل هو لك =يارسـول الله= قال : لا بل بعنيه • قال : قلت : فإن لرجل عليّ أوقية ذهب فهـو لك بها • قال : قد أخذته به فتبلغ عليه إلى المدينة ، قال : فلما قدمت المـدينـــة ••• الـخ •

وفي م ـ ٧/٣٣ : فلما قدم صرارا أمر ببقرة فذبحت فأكلوا منها ، فلما قدم المدينة أمرني أن آتي المسجد فأصلي ركعتين ، فوزن لي ثمن البعير فأرجح لي • (وهذا القدر كاف) •

**تەرجەمە :**

جابیر ـ رضي الله تعـــالى عنـــه ـ ئەفەرموێ : لە خدمەت پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ غەزامکرد • پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە پشتەوە پێم گەیی منیش سواری وشترێ بووم ، ماندوو بووبوو نەیەتوانی کە بڕوا • فەرمووی : چی لە وشترەکەت قەوماوە ؟ وتم : ماندوە،

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ دواکەوت لێیخوڕیو دۆعای بـۆ کرد [موسلیم ئەفەرموێ : بە پێی موبارەکی لیێداو دۆعای بۆ کـرد بـە رۆیینێکی وا رۆیی لەوەپێش قەد وا نەڕۆیی بوو ] هــەر لە بـەردەمی وشترەکانەوە بوو لە پێشەوە ئەڕۆیی ، پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليــه وسلم ـ فەرمووی : وشترەکەت چۆن ئەبینی ؟ وتم : چــاکی ئـەبینـم بەرەکەتی تۆی پێگەیی • فەرمووی : پێمئەفرۆشی ؟ حەیامکرد ، وشتری تریشمان نەبوو غــەیری ئەو وشـــترە • وتم : بەڵێ • فــەرمووی : پێمبفرۆشە • پێمفرۆت لە سەر ئەوە کە پشتی وشترەکە بۆ من بێ تــا مەدینە [ نەسائیی ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وســلم ـ فەرمووی : بەوەندە لێمکڕیتو پشتی وشترەکەم بە ئەمانەت دایتــێ تــا مەدینە ] جابیر ئەفەرموێ : وتم : ( یا رسول الله ) من تازەزاوام ، ئیذنم لێخواست ، ئیذنی دام ، پێش خەڵقەکە کەوتم بۆ مەدینە تا گەییمە مەدینە• خاڵم کە ثەعلەبەیە تووشم بوو ، حاڵی وشترەکەی لێ پرسیم خـەبـەرم دایێ کە فرۆتوومە بە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لەومی کردم کە بۆچیت فرۆتوە • جابیر ئەفەرموێ : لەو وەختەدا کە ئیذنم لێ خواست پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لێیپرســیم : کچت هێناوە یــا بێوەژن ؟ وتم : بێوەژن • فەرمووی : بۆ کچێکت نەهێناوە یاریی لەگەڵ کەیتو یاریت لەگەڵ بکا ؟ عەرزم کرد : (یا رسول الله) باوکم وەفــاتــی کردوە ، یا فەرمووی : شەهید کراوە ، خوشکێکی زۆرم هــەیە ، بــە ریوایەتێ حەوت ، بە ریوایەتێ نۆ ، حەزم نەکرد یەکێکی وەکوو ئـەوان بێنم کە بەسەریانەوە نەوەستێو تەربییەیان نەکا ، بێوەژنێکم هێنا کــە بەسەریانەوە بوەستێو تەعلیمو تەربییەیان بدا • جابیر ـ رضي الله تعــالى عنه ـ فەرمووی : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەشریفی هاتەوە

مەدینــە • بەیانیی وشترەکەم بردە خـدمەتی پارەی وشترەکەیشی دامیو وشترەکەیشی بۆ رەدکردمەوە •

موغیرەی کوڕی میقسەم ئەفەرموێ : ئەم نەوعە بەیعە کە شـــەرتی تیا ذیکر بکرێ لە حوکمی ئێمەدا بەیعێکی باش‌و جوانە . هیچ زەرەری نیە بۆ بەیعەکە زەرەری تیا نابینین •

لە حەدیثی ح‌ـ٤/١٥٥دا ئەفەرموێ : کە گەیینەوە مەدینە فەرمووی: ئەی بیلال قیمەتی وشترەکەی بدەرێ‌و بۆیشی زیاد بکە • بیلال ـ رضي الله تعالى عنه ـ چوار دیناری دایێ‌و قیراطێکیشی بۆ زیاد کـرد • جـابیر فەرمووی : ئەو زیادەی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لێم جوێ نابێتەوە • عەطاء کە یەکێکە لە راوییان =ئەفەرموێ= ئەو قیراطە زیادە لە کیسەی جابیر جوێ نەبۆوە •

لـە حەدیثی ح‌ـ٤/٣٤٢دا ئەفەرموێ : لەو قیراطە هیچی لێ کـــەم نەبووتا رۆژی (حەڕە) •

لە حەدیثی م‌ـ٧/٣٣دا ئەفەرموێ : لە دواییا پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ پێی‌فەرمووم : وشترەکەتم پێ بفرۆشە • عەرزم‌کرد : خەیر، هەروا بۆ تۆ بێ • فەرمووی : خەیر پێم‌بفرۆشە • عەرزم‌کرد : خەیر ، هەروا بۆ تۆ بێ (یا رسول الله) • فەرمووی : خەیر پێم‌بفرۆشە • عەرزم کرد : ئووقیەیێ ئاڵتوونی پیاوێکم لەسەرە بەوە بۆ تۆ بێ • فەرمووی . بەوە وەرم‌گرت ، پێی بگەرەوە مەدینە • جابیر فەرمووی : کە گەییمـــە مەدینە•••إلخ •

لە حەدیثی م ـ ٣٣/٧ ی دوەما ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ کە تەشریفی گەییە (صرار)ئەمری فەرموو : گاجووتێکیان

ســـەربڕیو لێیان خـــوارد ، کە تەشــریفی گەیی‌یە مەدینــە ئــەمــری پێکردم کە بچمە مزگەوت دوو ڕەکعەت نوێژ بکەم ، پارەی وشترەکەیان بۆ کێشام‌و سلاویان‌دایەوە •

**موعجیزەی ئــەم پارچەیە :**

بە قەمچی‌لێدانێ ، یا بە پێ تێوەژەنێ ئەو وشــترە لە هەموو وشترەکانی تر خۆشڕەوتر بوو ، لە هەموویان پێشکەوت •

**حوکمی ئــەم حەدیثانــە :**

بــەیعی بەشەرت دروستە •

( قبل الأخذ ) تەصەڕوف لە مەبیعا دروستە •

تەئدیەی بەدەلی مەبیع لە دوای بــەیـــع تەواوبوون ، ئیستیعجال‌تیا کردنی سوننەتە •

پارەی‌زیادەدان بە بایع سوننەتە •

بەخشینی بە صاحیبەکەی خۆی لە مەکاریمی ئەخلاقە •

تەلطیفی بوچووك لە مەکاریمی ئەخلاقە •

ئیرائەی[1] ڕێی چاکە بە مەعییەت سوننەتە •

کچ‌هێنان لە بێوەژن چاکترەو سوننەتە •

کە لە بێوەژن هێنانا مەصلەحەتێ ببێ کە لە کــچا نەبێ •• بێــوەژن لــە کــچ چاکترە •

گاڵتەو صوحبەت لەگەڵ ماڵ‌و منالا سوننەتە •

هیبەی ماڵ بە خۆڕایی بە گەورەی خۆی سوننەتە •

ئیطعامی طەعام بە مەعییەت ســـوننەتەو لە مەکاریمی ئــەخــلاقە •

---

(١) واتــە ڕێی چاکــە پیشاندان بە هاوڕێ •

له دوای عەودەت له سەفەر له پێش هــەمــوو شتێکا دوو رەکعەت نوێژ له مزگەوتا سونتەتە •

له تەئدیەی قەرزا زیاد له حەقی صاحیب قەرزەکە میقداریٚ پارەپێدانی ســـونتەتە •

کەسێ سواری حەیوانێ بووبێ یەکێکی تر لێی بخورێ لازمە ئـەو کەسە خەبەردار بکا کە خۆی توند بگرێو نەکەوێ •

**حديث جابر الطويل وقصة ابي اليَسَر كعب بن عمرو ـ رضي الله تعالى عنهما ـ • شهد العقبــة وبــدرا ، وهو آخر من توفي من أهل بــدر ـ رضي الله تعـــالى عنهم ـ •**

**٥٦٧/٢٩ ـ عن عبادة بن الوليد بن عبـــادة بن الصامت [رحمهما الله ورضي عنه ] قال : خرجت انا وابي نطلب العــلم =في هــذا الحي= من الانصار قبل ان يهلكوا فكان اول من لقينا ابا اليَسَر صاحب رســـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ومعه غلام له معه ضِمامـة [ الضِمامـة والاضمامة رزمة يضم بعضها الى بعض كالضِبارة والاضبارة لجماعة الكتب] من صحف ، وعلى ابي اليسر بُردة ومَعافري [ نوعان من اللباس ذلك الزمان] وعلى غلامه بردة ومعافري ، فقال ابي : يا عم اني ارى في وجهك سَفعَة [ علامة ] من غضب ؟ قال : أجل ، كان لي على فلان ابن فلان الحرامي مال ، فاتيت اهله فسلمت فقلت : ثم هو ؟ قالوا : لا • فخرج عليّ ابن له جفـر [ قارب البلوغ ] فقلت له : اين ابوك ؟ قال : سمع صوتك فدخل اريكــة أمي [ سريرة امي التي في الحجلة ] فقلت : اخرج إلي فقد علمت اين انت، فخرج • فقلت : ما حملك على ان اختبات مني ؟ قال : انا والله احدثك ثم لا أكذبك • خشيت والله ان احدثك فاكذبك ، وان اعدك فاخلفك ، وكنـت صاحب رسول الله ، وكنتُ والله معسرا • قال : قلت آلله ؟ قال : آلله • قال : قلت : آلله ؟ قال : آلله • قال : قلت آللهِ ؟ قال : آلله • قال : فاتى بصحيفة فمحاها بيده ، فقال : إن وجدت قضاء فاقضني ، والا انت في حل فاشهد ، بَصرُ [ بضم الراء • بَصرُ او بصر ، سمعُ او سميعَ • من النووي] هاتين ووضع أصبعه على عينيه ، وسَمْعُ اذني هاتين ، ووعاه قلبي هذا ،**

**واشار إلى مناط قلبه .. رسولَ الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وهـو يقول : من انْظَر مُعْسِراً ، أو وضع عنه اظله الله في ظله . قال : فقلت له أنا : يا عم لو انك أخذت بردة غلامك وأعطيته معافريك و [أي او] أخذت معافريه وأعطيته بردتك ، فكانت عليك حلة وعليه حلة . فمســح راســي وقال : اللهم بارك فيه . يا ابن أخي بَصُرَ عيني هاتين ، وســـمع اذني هاتين ، ووعاه قلبي هذا ، واشار إلى مناط قلبه .. رسولَ الله وهو يقول: اطعموهم مما تأكلون ، والبسوهم مما تلبسون ، وكان إن أعطيته من متــاع الدنيا اهون علي من أن يأخذ من حسناتي يوم القيامة .**

**تەرجەمە :**

عوبادەی کوڕی وەلیدی کوڕی عوبادەی کوڕی صامیت ـ رحمهما الله ورضي عنه ـ ئەفەرموێ : له خدمەت باوکما چووینه دەرێ تا له پێش ئەمەدا کە ئەنصار ئینقیراضیان بێ علمیان لێ فێر ببین ، ئەوەڵ کەس کە پێی گەیین ئەبولیەسر بوو صەحابەی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ورضي الله تعالى عنه ـ غولامێکی لەگەڵا بوو دەســـتەیێ کتێبی پێ بوو . ئەبولیەسر ـ رضي الله تعالى عنه ـ بوردەیێك‌و مەعافیرییێکی لە بەرا بـوو ، غولامەکەیشی بوردەیێك‌و مەعافیرییێکی لە بەرا بوو [ بورده وەکوو بەرماڵ ئەدەن بە سەرشانیانا ، مەعافیرییەکەیش وەکـــوو دەرپـــێ وەك پشتەماڵ سەتری عەورەتی پێ ئەکەن بە عادەتی عەرەبی پێشوو ] باوکم عەرزی کرد : مامە لە دەموچاوتا عەلامەتی غەضەب ئەبینم ؟ فەرمووی : بەڵێ لەسەر فلانی کوڕی فلانی حەرامیی قەرزم بوو ، چوومە لای ماڵ‌و منالەکەی ســـەلامم کردو وتم : فلان لەوێیە ؟ وتیان : خەیر . کوڕێکی عازەبی هاتەدەرێ ، لێم‌پرسیی : باوکت لە کوێیە ؟ وتی : دەنگی تۆی بیست‌و چوە نـــاو تەختەبەندو کوللەکەی دایکمەوە . وتم : وەرەدەرێ لام زانیم کە لـــە کوێی . هاتەدەرێ وتم : لەبەرچی خۆت شاردەوە لە من ؟ وتی : وەڵلاهی قسەت بۆ ئەکەم‌و درۆت لەگەڵ ناکەم ، وەڵلاهی لەوە ترسام کە قسەت بۆ

بکەمو درۆت لەگەڵا بکەم وەعدەت پێ بدەموەعدە خیلافیت لەگەڵا بکەم، تۆیش صاحیبی پێغەمەر بووی ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ [ بۆیە خۆمم لێ شاردیەوە ] وەڵلاهی دەستتەنگ بووم • فەرمووی : وتم : وەڵلاهی ؟ وتی : وەڵلاهی • وتم : وەڵلاهی ؟ وتی : وەڵلاهی • وتم : وەڵلاهی ؟ وتی : وەڵلاهی [ سێجار ] دەفتەری قەرزەکەی هێناو بە دەستی خـۆی مەحوی‌کردەوە ، فەرمووی : ئەگەر دەستت بوو بمدەیتەوە بمدەرەوە ، ئەگەر دەستت نەبوو گەردنت ئازاد بێ • بینایی ئــەم دووچاوەم دی • دەستی نایە سەر هەردوو چاوی ، ئەم دوو گوێیەم بیستیان ، ئەم دڵـــەم حیفظی کرد • دەستی نایە =سەر= بەندی دڵی لە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ کە ئەیفەرموو : هەرکەسێ قەرزدارێکی دەستتەنگ مۆڵەت بدا یا شتێك لە قەرزەکەی داشکێنێ خوا لە ژێر سێبەری رەحمەتی خۆیا جێی ئەکاتەوە •

عوبادە ئەڵێ : من عەرزم‌کرد : مامە ئەگەر بوردەی غولامەکە بــۆ خۆت وەرگریو مەعافیرییەکەتی بدەیتێ ، یا مەعافیرییەکەی لێبســتێنیو بوردەکەی خۆتی بدەیتێ تۆیش دەستێکی رێکت ئەبێو ئەویش دەسـتێکی رێکی ئەبێ • دەستی هێنا بەسەرماو فەرمووی : یاخوا بەرەکەتـــــی بدەیتێ ، ئەی کوڕی برای خۆم ئەم دووچاوەم بینییان ، ئەم دوو گوێیەم بیستیان ، ئەم دڵەم حیفظی کرد ، دەستی نایە سەر بەندی دڵی •• لـــە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ کە ئەیفەرموو : لەوەی کە ئەیخۆن دەرخواردیان بدەن ، لەوەی کە ئەیپۆشن پێیان‌بپۆشن •• لە مەتاعی دنیامی بدەمێ لە لام سووکترە کە لە رۆژی قیامەتا لە حەسەناتم وەربگرێ •

لەم قیطعەدا بەیانی موعجیزەی تیا نیە •

**ئـەحکـامی :**

ئیختیاری مەشەققەتی سەفەر بۆ تەحصیلی عیلـــم عادەتی سەلەفە .

لەبەر نەبوونیی دروستە خۆ لە صاحیب قەرزشاردنەوە .

لەگەڵ صاحیب حەقا راستگۆیی .

وەعدەخیلافیی‌نەکردن لازمە .

شت بەخدمەتکارهەڵگرتن دروستە .

موهڵەتی قەرزدار یا لە قەرزداشکانی سوننەتێکی گەورەیە فەرموودەی پێغەمەرە ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ

لە لیباساو لە خواردنا فەرقی خۆی‌و خزمەتکارنەکردن سوننەتـــــی پێغەمەرە ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ئەمری پێ‌کردوە .

دەستبەســـەراهێنانی منـــاڵو مولاطەفەلەگـــەڵاکردنـــی‌و دۆعای خێربۆکردنی سوننەتە .

لە حینی حاجەتا تەقویەی قسە بە سوێندان ، بە سوێن‌خواردن بـــە سائیری ئیشارەت‌و شتی تر دروستە لە ئاثاری سەلەفی صالیحە ـ رحمهم الله ورضي عنهم ـ .

**ثم مضينا حتى أتينا جابر بن عبدالله في مسجده وهو يصلي في ثـوب واحد مشتملا به ، فتخطيت القوم حتى جلست بينه وبين القبلة . فقلت : يرحمك الله اتصلي في ثوب واحد ورداؤك إلى جنبك ؟ قال : فقال بيده في صدري هكذا . وفرق بين اصابعه وقوسها : اردت ان يدخل علي الاحمـق مثلك فيراني كيف اصنع فيصنع مثله . اتانا رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ في مسجدنا هذا وفي يده عرجون ابن طاب ، فرای في قبـــلة المسجد نخامة فحكها بالعرجون ، ثم اقبل علينا فقال : ايكم يحب ان يعرض الله عنـه ؟ قـــال : فخشـــينا . ثـم قـــال : أيـكم يحب أن يعرض الله عنـه ؟ قلنا : لا أينا يا رســـول الله . قـــال : فان أحدكم إذا قام يصلي فان**

**الله ـ تبارك وتعالى ـ قِبل وجهه ، فلا يَبْصِقنّ قبل وجهه ، ولا عـن يمينه ، وليبصق عن يساره تحت رجله اليسرى ، فان عجلت به بادرة فليقل بثوبه هكذا ، ثم طوى ثوبه بعضه على بعض . فقـال : اروني عبيرا [ اخلاط طيب يجمع بالزعفران ] فثار فتى من الحي يشتد إلى اهله فجاء بخلوق في راحته ، فأخذه رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فجعله على راس العُرجون ثم لطخ به على أثر النخامة فقال جابر [رضي الله تعالى عنه] : فمِنْ هناك جعلتم الخَلوق في مساجدكم :**

**تەرجەمە :**

عوبادە ئەفەرموێ : لە دواییا رۆیین تا چـووینە لای جابـیری بنی عەبدوڵلا ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لە مزگەوتی خۆیا نوێژی ئەکرد لــە تەنها یەك لیباسا لە خۆیەوە پێچابوو ، هەنگاوم بەسەر خەڵقا هێنا تا چووم لە بەینی ئەوو قیبلەدا دانیشتم وتم : ( یرحمك الله ) تۆ لە لیباسێکا نوێـژ ئەکەیتو ڕیداکەت لە تەنیشتەوەیە ! عوبادە فەرمووی : بە دەستی بــەم نەوعە ماڵیی بە سنگما ، بەم نەوعە پەنجەکانی بڵاوکردەوەو کردی بــە قەوس ، فەرمووی : مەقصوودم وابوو ئەحمەقێکی وەکوو تـــۆ بمبینێ ئەویش وەکوو من بکا . پێغەمەر ـ صـــلى الله تعالى عليه وســلم ـ لەم مزگەوتەدا تەشریفی هاتە لامان لقێ لە دارخورمای ئیبنوطابی بە دەستەوە بوو ، لە قیبلەی مزگەوتەکەدا بەڵغەمێکی دی بە لقەدارخورماکە کـڕانی ، لە دواییا ڕووی‌تێکردین فەرمووی : کامتان حەزەکا کە خوا ڕووی لــێ وەربگێڕێ ؟ فەرمووی : لەوە ترساین . لـــە دواییا فەرمووی : کامتان حەزەکا کە خوا ڕووی لێ وەربگێڕێ ؟ وتمان : هیچمان ( یارســـول الله ) فەرمووی : کە وابێ یەکێکتان کە ڕاوەستا نوێژ بکا خوا ـ تبارك وتعالى ـ لە بەردەمیەوەیە . کە وابێ ئینسان نە لە بەردەمیەوە تف بکا ، نە لە لای ڕاستیەوە ، لە لای چەپیەوە لە ژێر پێی چەپیا تف بکا ، ئەگەر شـــتێکی کوتوپڕی بەسەرا هاتو نەیەرژا کە وا بکا بە لیباسەکەی بەم نەوعە بکا ،

لە دوایدا پێغەمەر ــ صلی اللە تعالی علیە وسلم ــ لیباسەکەی دووقەد کرد فەرمووی : عەبیرم بۆ بێنن ، کوڕێکی عازەب گورج هەڵسا بە هەڕاکردن چوە ماڵی خۆیانو عەبیرێکی هێنا لە بەری دەستیا • پێغەمەر ــ صلی اللە تعالی علیە وسلم ــ وەری گرت کردی بە سەری دارخورماکەوەو سووی بە شوێنی بەڵغەمەکەدا ، جابیر فەرمووی : بۆیە شتی بۆنخۆش ئەهێنـــــە مزگەوتەکانتانەوە •

لەم قیطعەیشا موعجیزەی تیا بەیان نەکراوە •

حوکمــی :

ئینسان شتێکی خیلافی عادەتی بینی لازمە لە سەبەبی بپرسێ • ئەوی کە ئەیکا تەئویلێکی بە دەستەوە بێ بەیانی بکا ، مەعقوول بــوو قەبووڵ بکرێ • فەقەط لەم پارچەدا بەیانی نەکردوە ، لە دوایدا بەیانی ئەکا •

بۆ دروستبوونی نوێژ سەتری عەورەت کافیە ، جلی زۆرلەبەرکردن لازم نیە •

پیاوی گەورە لە وەختی تەعلیما بۆی دروستە بەو شەرتە مەقصوودی تەحقیر نەبێ دەرحەقی موتەعەالیم لەفظی ئەحمەق ، جاهێڵ ئیستیعمال بکا، پەیرەوی عولەما لازمە بۆیە گوناهی عالم صەدچەندانی گوناهی جاهێڵە •

ئینسان بەڕێدا بڕوا داربەدەستەوەگرتن سوننەتە •

بۆ پیاوی موقتەدیر ئینکاری مونکەر لازمە بەرەوقیبلە بـــــە لای راستا تفڕێدان مەکرووهە •

تەلویثی مزگەوت حەرامە ، تەلویثی کرا دەزبەجێ ئەبێ پاكبکرێتەوە •

بەڵغەمی هات بیکاتە لای چەپ ژێر پێی چەپ ، مومکین نەبوو بیکاتە نـاو پەڕۆیێکەوە نەیدا بە دارو دیوارو جێگەیێکا کە خەڵق بیبینن •

موراد لەمە خوا ـ عز وجل ـ لە بەردەمی نوێژکەرەوەیە قیبلەی خوایە یا جێیێکە خوا ئەمری بە تەعظیمی کردوە ، خێرایی کردن لە بەجێ‌هێنانی ئەمری ئامیرا لازمە •

سرنا مع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ في غـــزوة بطن بُواط [بەسەرو بۆری (ب) شاخێکە لە جوهەینە] وهو يطلب المجدي بـن عمرو الجُهَني ، وكان الناضح يعتقبه منا الخمسة والستة والسبعة ، فدارت عُقْبَة رجل [نوبته] من الأنصار على ناضح له فأناخه فركبه ثم بعثه فتلدّن [توقف] عليه بعض التلدن ، فقال =له= : شأ لعنك الله • فقال رسول‌الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ: من هذا اللاعن بعيره ؟ قال : أنـا يـا رسول الله • قال : انزل عنه فلا يصحبنا بملعون ، لا تدعوا على أنفسكم ولا تدعوا على أولادكم ، ولا تدعوا على أموالكم ، لا توفقوا من الله ساعة يسأل فيها عطاء فيستجيب لكم :

**تەرجەمە :**

لە خدمەت پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ چووین بۆ غەزای بەطنی بەواط ، قەصدی مەجدیی کوڕی عەمری جوهەنیی ئەفەرمـــوو ، وابوو وشترێ پێنج کەس ، شەش کەس ، حەوت کەس بە نۆبە سـواری ئەبوون • نۆبەتی پیاوێکی ئەنصاریی هاتە سەر وشترێکی خۆی کە سواری بێ ، پیخی دا سواری بوو هەڵی‌ستان ، لە هەڵسانا نەختێ درەنگی کرد ، ئەنصارییەکە پێی‌وت : شەء [ یەعنی هەچچە ] خوا لەعنەتت لـــێ بکا • پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : ئەوە کێیە لەعن لـــە وشترەکەی ئەکا ؟ وتی : منم ( یارسول الله ) • فەرمووی : لێی دابەزە لەگەڵ مەلعوونا رەفیقایەتیمان نەکا ( إلتفات ) • دۆعا لە خۆتان مەکەن ، دۆعا لە منالتان مەکەن ، دۆعا لە ماڵتان مەکەن مەبادا لە خواوە سـاعەتـێ

راستبێن کە لەو ساعەتەدا شتێکی لێ‌طەلەب بکرێت‌و لێتان قەبووڵ بکا •
ئەم فەقرەیەیش موعجیزەی تیا نیە •

**حـوکـمی :**

لەعنی حەیوان حەرامە •

دۆعاکردن لە خۆی ، لە ماڵی ، لە مناڵی بە غەیری لەعن مەکرووهە •
هەموو شەوو رۆژێ ساعەتێکی تیا هەیە کە دۆعای تیا قەبووڵ‌بێ •

( عینا )وە ( مثلا ) یا زۆرتر ( مثلا ) یا ئیمرۆ داوای قەرانێ بکەی ئەو لە دوای ساڵێ هەزار لیرەت بداتێ •

سرنا مع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ حتى إذا كـــانت عُشَيْشِيةً ودنونا ماء من مياه العَرَب ، قال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : من رجل يتقدَّمُنا فيمدر الحوض [ يُطيِّنه ويصلحـه ] فيشرب ويسقينا • قال جابر : فقمت فقلت : هذا رجل يارسول الله• فقال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : أي رجل مع جابر ؟ فقام جبار بن صخر ، فانطلقنا إلى البئر ، فنزعنا في الحوض سَجْلا وسَجْلين ، ثم مدرناه ، ثم نزعنا فيه حتى أفهقناه [أصفقناه ملأناه] فكان أول طالع علينا رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقال : أتأذنان ؟ قلنا : نعـم• يا رسول الله فأشْرَعَ ناقته [أرسل رأسها في الماء لتشرب] فشربت فشنق لها [كفّها بزمامها ] فشجت [فرّجت بين رجليها ] فبالت ، ثم عدل بهـا فأناخها ، ثم جاء رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وســـلم ـ إلى الحـوض فتوضأ منه ، ثم قمت فتوضأت من متوضَّأِ رسول الله ـ صلى الله تعـالى عليه وسلم ـ فذهب جبار بن صخر يقضي حاجته ، فقام رسول الله ـصلى الله تعالى عليه وسلم ـ ليصلي وكانت عليَّ بردة ذهبت أن أخـالف بيـن طرفيها فلم تبلغ لي وكانت لها ذباذب [جمع ذِبْذِب أي أهداب] فنكستها،

ثم خالفتُ بين طرفيها ثم تواقصت عليها [أي أمسكت عليها بعنقي] = ثم جئت= حتى قمت عن يسار رسول الله ــ صلى الله تعالى عليه وسلم ــ فأخذ بيدي فأدارني حتى أقامني عن يمينه ، ثم جاء جبار بن صخر فتوضأ ، ثم جاء فقام عن يسار رسول الله ــ صلى الله تعالى عليه وسلم ــ فأخذ رسول‌الله ــ صلى الله تعالى عليه وسلم ــ بأيدينا جميعا ، فدفَعنا حتى أقامنا خلفه ، فجعل رسول الله ــ صلى الله تعالى عليه وسلم ــ يرمُقني [ينظر إلي متتابعا] وأنا لا أشعر ، ثم فطنت به • فقال هكذا بيده ، يعني شد وسطك• فلما فرغ رسول الله ــ صلى الله تعالى عليه وسلم ــ قال : يا جابر • قلت: لبيك يارسول الله • قال : إذا كان واسعا فخالف بين طرفيه ، وإذا كان ضيّقا فاشدده على حِقْوك [بفتح الحاء وكسرها معقد الإزار] •

**تەرجەمە :**

لەم فەقرەیەیشا بەیانی موعجیزە نیە ، ئەمما جوابی عوبادەی تیایە •

رۆیین لە خدمەت پێغەمەرا ــ صلى الله تعالى عليه وسلم ــ تا وەختی ئێوارێ هات لە ئاوێکی عەرەب نزیك بووینەوە پێغەمەر ــ صلى الله تعالى عليه وسلم ــ فەرمووی : چ پیاوێك پێشمان ئەکەوێ‌و ناوی حەوزەکـــە قورِ ئەداو چاکی ئەکا ئاوی لەبەر نەڕوا خۆیشی بخواتەوەو بیشیدا بە ئێمە بیخۆینەوە ؟ جابیر فەرمووی : من هەڵسام‌و وتم : ( یا رســـول الله ) ئەمەپیاوێکە• لە دواییا پێغەمەر ــ صلى الله تعالى عليه وسلم ــ فەرمووی: کام پیاو لەگەڵ جابیر ئەچێ ؟ جەبباری کوڕی صەخر هەڵسا ، هەردوکمان چووین بۆ لای بیرەکە ، یەك دوو دۆڵکەمان هەڵێنجایە ناو حەوزەکە • ناوەکەمان سواغدا ، لە دواییا ئاومان تێ هەڵێنجا تا پڕمان کرد• ئەوەڵ کەسێ کە تەشریفی طولووعی کرد لەسەر ئێمە ( رسول الله ) بو ــ صلى الله تعالى عليه وسلم ــ فەرمووی : ئیذنتان هەیە ؟ عــەرزمانکــرد : بەڵێ

(یا رسول الله) پێغەمەر ـ صلی الله تعـالی علیه وســلم ـ دەستەجڵەوی وشترەکەی شلکرد ، وشترەکەی ئـاوی خـواردەوە ، دەستەجڵەوەکەی توندکردەوە وشترەکەی لنگی لێ بڵاوکردو میزی کرد •

له پاشا پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ لەسەر حـەوزەکـە تەشریفی گەڕایەوە دواوەو وشترەکەی پیخدا ، له دوایا پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ تەشریفی هاته سەر حەوزەکه دەزنوێژی لێ شت ، له دوایا منیش هەڵسام دەزنوێژم له جێ دەزنوێژەکەی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ شت • جەبباری بنی صەخر ـ رضي الله تعالی عنه ـ چوو قەضای حاجەتی کرد ، پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ تەشریفی هەڵسا که نوێژ بکا منیش بوردەییەکم بوو تەمام بوو راستو چەپی بکەم بۆمنەگەییەوە ، ریشووی بوو سەرەوخوارم کرد راستو چەپمکرد ، لای چەپم خسته سەرشانی راستم ، لای راستم خسته سەر شانی چەپم ، لـه دوایا هاتم له تەنیشتی چەپی پێغەمەرەوە ـ صلی الله تعالی علیه وسـلم ـ راوەستام • پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ دەستی گرتم گێڕامیه لای راستی خۆی ، له دوایا جەبباری بنی صەخریش ـ رضي الله تعـالی عنه ـ هات دەزنوێژی شت ، له دوایا هـــات له طـــەرەفی لای چەپی پێغەمـــەرەوە ـ صـلی الله تعـــالی علیـــه وســـلم ـ راوەســـــتا ، پێغەمەر ـ صـــلی الله تعـــالی علیـــه وسلم ـ دەستی هەردووکی گـرتیـن پاشەوپاش بردینی تا له پشتی خۆیەوە رایوەستانین ، لـــه پـاش ئـەوە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ هەر تیمئەفکری تییئەگەییم ، لـه دوایا تێگەییم به دەستی وای کرد ، یەعنی فەرمووی : ناوقەدت ببەستە• که له نوێژ بۆوە فەرمووی : ئەی جابیر • عەرزمکرد : بەڵێ له خدمەتتام (یا رسول الله) فەرمووی : ئەو لیباسەی که خۆتی پێ دائەپۆشیی ئەگـەر

گەورە بێ راستو چەپی کە ، لە بەینی گۆشەکانیا ئەگەر تەنگ بێ لـە جێی بەندەخوێنەوە بێ‌بەستە •

لـەم پارچەدا جوابی سوئالەکەی عوببادەی تیا هـەیـە ، بـەیـانـی موعجیزەی تیا نیـە •

**ئـەحكـامی :**

وەختی نوێژ ئاو نزیك بێ لە پێشەوە یەك دوو کەسێ نـاردنبـــۆ حازرکردنی ئاوەکە سوننەتە •

کەسێ شتێکی موباحی ئیحراز کرد خەڵقی تر ئیرادەی کـرد کـــە ئیستیفادەی لێ بکا ، با ظەننی رەزایشی بێ ، سوننەت وایە ئیذنی لـێ بخوازێ لەوەدا پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیـــە وســـلم ـ بۆ ئیرشادی ئوممەتەکەی ئیستیذانی لە جابیرو جەبار ـ رضي الله تعالی عنهما ـ کردوە•

موراعاتی گەورەکردن پێشخستنی لە خۆی لە حوسنی موعاشەرەتو ئـادابـــە •

موسافیر کە گەیی‌یە مەنزڵ لە پێشا سوننەت وایە ئیحتیاجیی ئـــەو حەیوانەی کەئەوی گەیاتۆتە مەنزڵ دەفع بکرێ •

سەتری عەورەت لازمـە •

ئەگەر لیباس واسیع بێ لە بەرۆکیەوە ئیحتیمالی عەورەت بینین بـێ لازمە کە بە پشتێن‌بەستن بە هەرچییە بێ دەفعی ئەو ئیحتیماله بکـرێ ، گەورە بانگی بچووکی کرد بچووك بە تەعظیم جوابی گەورەی خـۆی بـداتـــەوە •

حەیوانی پاك لە ئاوی خواردەوە دروســـتە دەزنوێژی لێ‌بشۆی • پاشماوەی حەیوانی پاك پاکە •

فیعلی کەم لە نوێژا نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە ، ئەگەر لە ئیحتیاجەوە بـێ سوننەتە ، بە بێ لوزووم مەکرووهە •

مەئموم یەکێ بێ لە تەنیشتی راستی ئیمامەوە رابوەستێ ، لــە تەنیشتی چەپەوە وەستا ئیمام وەری گێڕێتە لای راست ، یەکێکی تر لە دوای ئەوەوە بێ لای چەپی ئیمام راوەستێ ، لە دوایبا ئیمام هەردوکیان بخاتە پشتەوە ، ئەگەر لە ئەوەڵەوە دوان بن صەف ببەستن •

سرنا مع رسول الله ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ وكـان قوت كل رجل منا كل يوم تمرة ، فكان يمصها [بفتح الميم والضم] ثم يَصُرُّهـا =في ثوبه= وكنا نختبط بقسيِّنا ونأكل حتى قرحت أشداقنا ، فأُقْسِمُ أخطِئها رجل منا يوما فانطلقنا به تنعَشه [من باب فتح] فشهدنا أنــه لـم يُعطَها فأُعْطِيها فقام فأخذها :

**تەرجەمە :**

ئەمەیش موعجیزەی تیا بەیان‌نەکراوە •

لە خدمەت پێغەمەرا ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ رۆیین قــوتــی کوللی ئینسانێ لە ئێمە رۆژی دەنکێ خورما بوو ئەیمژیی لە دوایبا لـــە =جلەکانیا= گرێی ئەدا • بـــە کەوانەکەمان گـــەڵای دارمـان ئەوەران ئەمان‌خوارد تا لالەغاوەمان بریندار بوو ! سوێند ئەخۆم رۆژێ یـەکـێ لە ئێمە لە فکرچۆوەکە بیدەنێ ، بردمانە لای ئەو کەسەی کە خورماکەی تەقسیم‌ئەکرد ، لەبەر زەعیفیی لە رێ هەڵمان‌ئەگرت ! شەهادەتمان بۆ دا کە نەیدراوەتێ درایێ هەڵساو وەری گرت •

بەیانی صەبری ئەصحاب‌و قەناعەت‌و ئیطاعەیان ئەکـــا ـ رضي الله تعالی عنهم ـ •

شەهادەت لەسەر نەفی مەحصوور دروستە •

تەعیینی مەئموور بۆ تەقسیمی حەوائیج لـــە بەینی موحتاجـانـا ، تەسلیمی ( بیت المال ) بە یەکێ دروستەو موافیقی مەصڵەحەتە •

سرنا مع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ حتى نزلنا واديـا أفْيَح [أي واسعا] فذهب رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يقضي حاجته فاتبعته بأداوة من ماء ، فنـظر رسـول الله ـ صلى الله تعـالى عليه وسلم ـ فلم ير شيئا يستتر به ، فإذا شجرتان بشاطىء الوادي [ جانبه ] فانطلق رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ إلى إحداهما فأخذ بغصن من أغصانها ، فقال : انقادي عليّ بإذن الله ، فانقادت معه كالبعيرالمخشوش الذي يصانع قائده ، حتى أتى الشجرة الأخرى فأخذ بغصن من أغصانهـا فقال : انقادي عليّ بإذن الله ، فانقادت معه كـــذلك ، حتى إذا كـــان بالمَنْصَف مما بينهما لأم بينهما ، يعني جمعهما ، فقال : التئما علي بإذن الله فالتأمتا ! قال جابر : فخرجت أحْضِر [ أعدو وأسعى سعيا شـديدا ] مخافة أن يُحِسّ رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بقربي فيبتعد• وقـال محمد بن عَبّاد : فيتبعدَ • فجلست أحدّث نفسي ، فحانت مني لَفْتة [ نظرة حانت ، حالت ، وقعت ، اتفقت ، كانت النووي ] فإذا أنا برسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ مقبلا ، وإذا الشـــجرتان قـد افترقتا ، فقامت كل واحدة منهما على ساق فرأيت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وقف وقفة ، فقال برأسه هكذا وأشار أبو إسـماعيل [حاتم بن إسماعيل] برأسه يمينا وشمالا ، ثم أقبل فلما انتهى إلي قـال : يا جابر هل رأيت مقامي ؟ قلت : نعم يارسول الله • قـال : فانطلق إلى الشجرتين فاقطع من كل واحدة منهما غصنا فاقبل بهما حتى إذا قمت مقامي فأرسل غصنا عن يمينك وغصنا عن يسارك • قال جابر : فقمت فأخذت حجرا فكسرته وحَسَرْته فانذلق لي [احددته فصار حادا ] فأتيت الشجرتين

فقطعت من كل واحدة منهما غصنا ، ثم أقبلت أجـرهـما حتى قمت مقـام رسول الله – صلى الله تعالى عليه وسلم ـ أرسلت غصنا عن يميني وغصنا عن يساري ، ثم لحقته فقلت : قد فعلت يا رسول الله فعَمَّ ذلك ؟ قال : إني مررت بقبرين يعذبان ، فأحببت بشفاعتي أن يرفّه عنهما مادام الغصنان رطبيــن :

**تەرجەمە :**

لە خدمەت پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ رۆیین تـا لـــە دۆڵێکی پانا دابەزین ، پێغەمەر – صلى الله تعالى عليه وسـلم ـ تەشریفی چوو بۆ قەزای حاجەت ، مەتارەیێکم بە شوێنا برد • پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم – تەماشای کرد هیچی نەبینی کە خۆیی پێ سەتر بکا لە خەڵق کە نەیبینن ، دوو درەختی دی لە کەناری دۆڵەکە • پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم – تەشریفی چوو بە لای یەکێکیانەوە ، لـــە لقـەکانی لقێکی گرت ، فەرمووی : ئیطاعەم بکە بە ئیذنی خوا ، وەکوو چـــۆن وشتری سەرکێش خیشاشی [ دارێکە ئەخرێتە لووتی وشتری سەرڕەق کە ئیطاعەی صاحیبەکەی بکا ، پەتێك ئەخەنە ئەو دارە ، بەوە رای ئەکێشن =هەر= جارێ خۆی ئەکێشێتە دواوە] ئەخرێتە لووتەوەو لەگەڵ صاحیبەکەی چی ئەکا بەو نەوعە ئیطاعەی کردو لە خدمەتیا هات تا تەشریفی چوو بۆ لای درەختەکەی تر ، لە لقەکانی لقێکی گرت ، فەرمووی : ئیطاعەتم بکە بـە ئیذنی خوا ، ئەویش وەکوو درەختەکەی تر چۆنی ئیطاعەکرد ئیطـــاعەی کردو ، هەردووکی هێنان تا ناوەڕاستی جێی هەردوو درەختەکە ، هەردووکی هێنایە لای یەك فەرمووی : بە ئیذنی خوا بۆم بەیەکەوە بنووســـێن ، بەیەکەوە نووسان ! جابیر فەرمووی : منیش لەوێ لاچووم بە هەڕاکردن دوورکەوتمەوە مەبادا پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرق بـەوە بکا کە منی لێ نزیکمو دووربکەوێتەوە • دانیشتمو خەیاڵی دڵی خۆمـم

لێك ئەدايەوە • سا چۆن ئاورێكم دايەوە كەچی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی عليه وســلم ـ تەشريفی ئەهات درەختەكانيش لێك جویێ بووبوونەوە ، هەريەك لەسەر بنكی خۆی راوەستا بوو • پێغەمەرم دی ـ صلی الله تعالی عليه وسلم ـ تەوەققوفێكی كرد ، بە سەری وای كرد ، ئەبو ئيسماعيلی راويی بە سەری ئيشارەتی لای راستو لای چەپی خۆی كرد ، لە دواييا تەشريفی رووی كردە طەرەفی منو هات فەرمووی : يا جابير ئەو جێيەت دی كە من لێی راوەستامو تەوەققوفم كرد ؟ وتم : بەڵێ (يا رسول الله ) فەرمووی : بچۆ بۆ لای درەختەكان ، درەختی لقێكی لێ ببڕە بيانهێنــە تــا ئەو جێيەی كە لێی راوەستام لقێكی بە لای راستتاو لقێكی بە لای چەپتا بەربدەرەوە • جابير فەرمووی : هەڵسام بەردێكم هەڵگرت شكانم تيژمكرد ئەويش تيژ بوو ، چووم بە لای درەختەكانەوە هەر يەكی لقێكم لێ بڕين ، لە دواييا رووم كردە ئەو جێيەی كە پێغەمەر ـ صلی الله تعــالی عليه وسلم ـ ئەمری پێ كردبووم تا گەييمە ئەوێو وەستام لە جێ وەستانی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی عليه وسلم ـ لقێكم لە تەنيشتی راســــتمەوە لقێكم لە تەنيشتی چەپمەوە دانا ، لە دواييا هاتمەوە خدمەتی وتم : ( يا رسول الله ) كردم ، ئەوە لەبەر چی بوو ؟ فەرمووی : بە لای دوو قەبرا رابوردم عەذاب ئەدران حەزمكرد بە شەفاعەتی من عەذابيان لێ ســـووك بێ تا لقەكان بە تەڕيی بمێننەوە •

**موعجيزەی ئــەم پارچــە :**

درەخت شوعووری نيە ، لە قســە ناگــا ، بە موعجــيزەی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی عليه وسلم ـ ••• خوا شوعووری تيا خەلق كرد ، لــە ئەمرەكەی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی عليه وسلم ـ گەيی •

درەخت حەرەكەی ئيختياريی نيە ، هەر حەرەكەی نيمائيی هەيە ، لە جێی خۆی نابزوێ بە ئەمری پێغەمەر ـ صلی الله تعالی عليه وسلم ـ وەك

چۆن مەهاری وشتر رائەکێشرا پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ لقێکی گرتن‌و رایکێشان لە خدمەتیا تا ناوەڕاستی بەینی هـــەردوکیان هـاتن‌و بەیەکەوە نووسان •

درەخت لە جێی خۆی هەڵکەنرا ئەمجا بە ئاودان‌و خزمەتی زۆر تـا ساڵێ جێی خۆی ناگرێتەوە ئەویش گەڵێکی لێ وشـــــك ئەبێ • بـــە موعجیزەی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ لە موددەی قـەضـای حاجەتێکا لە جێی خۆیان بزووتن چوونە جێیەکی تر روان ، هـــەر لـەو دەقیقەدا لە یەك جوێ‌بوونەوە ، هەر یەك چوەوە جێی خۆی، وەکوو هیچ لە جێی خۆی نەبزووتبێ لێی روایەوە ، هیچ گەڵایێکی لێ‌هەڵنەوەری •

پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ هیچ ئاثاری نەدیبوو لەوێدا خوا عیلمی پێ‌عەطاکرد کە قەبر هەیە گوێی لە هاوار هاواریان بوو کە عەذاب ئـەدرێـن !

درەخت ذیکر ئەکا تا تەڕیی تیا بمێنێ ، کە مرد یەعنی کە وشك‌بوو ئەویش ئەو نوطقەی کە مەخصووصە بە خۆیەوە نامێنێ •

شتی تەڕ یەعنی درەخت یا گیاوگوڵ بە رەگەوە بە بێ رەگ لەسەر قەبـر دانان سوننەتە •

بڕینی دروونەوەی درەخت‌و گیای سەر قەبر حـــەرامە ؛ چونـکی ئیذن‌لێ‌خواستنی مومکین نیەو ئیمکانی نەماوە • لە وەختی قەزای حاجەتا لە خەڵق دوورکەوتنەوە (تستر)[1] بە شتێك کە خەڵق نەیبینێ سوننەتە •

ئاوی دەزنوێژو ئاوی تارەت بۆ ئەهلی فەضل حازرکردن خدمەتـی ئەهلی فەضل سوننەتەو مووجیبی فەخرو شەرەفە •

(١) خۆداپۆشـین •

قال : فأتينا العسكر ، فقال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ: يا جابر نادِ بوَضوء • فقلت : ألا وضوء ؟ ألا وضــوء ؟ ألا وضــوء ؟ قال : قلت : يارسول الله ماوجدت في الركب من قطرة • وكان رجل من الأنصار يُبرّدُ لرسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ الماء في أشجاب له على حِمارة من جريد [الأشجاب • جمع شجب ، السقاء الذي قد اخلق وبَلِيَ وصار شنًّا ، الحِمارة : أعواد تعلق عليها أسقية الماء ] قــال : فقال لي : انطلق إلى فلان بن فلان الأنصاري فانظر هل في أشْجابه من شيء ؟ قال : فانطلقت =إليه= فنظرت فيها فلم أجد فيها إلا قطرة فــي عزلاء شَجْب منها لو أني أُفرِغه لشَربه يابسه فأتيت رسول الله ـصلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقلت : يارسول الله لم أجد فيها إلا قطرة في عزلاء شَجْب منها لو أني أفرغه لشربه يابسه • قال : اذهب فأتني به ، فأتيته به ، فأخذه بيده ، فجعل يتكلم بشيء لا أدري ماهو ، ويغمزه بيــديه • ثم أعطانيه ، فقال : يا جابر ناد بجفنة ، فقلت : يا جفنة الركب ! فأتِيتْ بها تُحْمَل فوضعتها بين يديه • فقال رسول‌الله ـصلى‌الله‌تعالى‌عليه‌وسلم ـ بيده‌في الجفنة‌هكذا فبسطها وفرّق بين‌أصابعه ثم وضعها في‌قعرالجفنة•وقال: خذ ياجابر فصب عليّ وقل بسم الله فصببت عليه وقلت بسم الله ، فرأيت الماء يفور من بين أصابع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ثم فارت الجفنة ودارت حتى امتلأت • فقال : يا جابر ناد من كانت له حاجة بماء• قال : فأتى الناس فاستقَوْا حتى رَوُوْا • قال : فقلت : هل بقي أحــد له حاجة ؟ فرفع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يده من الجفنــة وهي ملأى :

**تەرجەمە :**

جابیر فەرمووی : هاتینە لای عەسکەرەکەوە پێغەمبەر ـ صـــلی اللّٰە

تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : ئەی جابیر بانگ بۆ ئاوی دەزنوێژ بکە ، بانگم‌کرد : ئاوی دەزنوێژ نیە ؟ ئـــاوی دەزنوێژ نیـــە ؟ ئـاوی دەزنوێـژ نیە ؟ وتم : (یا رسول الله) لە عەسکەرەکەدا قەترەیێ ئاوم دەس‌نەکەوت. پیاوێ لە ئەنصار لە چەند کونە کۆنێکا لە ســـەر دارکونە ئـــاوی بۆ پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ سارد ئەکرد . پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ پێی‌فەرمووم : بچۆرە لای فلانی کـــوڕی فـــلانـی ئەنصاریی تەماشاکە لە ناو کونەکانیا هیچ ئاو هەیە . فەرمووی : چـووم تەماشام کردن لە هیچیانا ئاو نەبوو ، لە هەنگلی کونەیێکیانا قـەترەیێ ئاو بوو ئەگەر رژی بکەم طەرەفی وشکیی کونەکە ئەیخواتەوە ، یەعنی ناگاتە خوارێ ، دەرکی کونەکە . چوومە خدمەت پێغەمەر ـ صـلی الله تعالی علیه وسلم ـ عەرزم‌کرد : لە هیچیانا ئاوم دەست‌نەکەوت ئیللا لـە هەنگلی کونەیێکیانا نەبێ کە قەترەیێ ئاوی تیا بوو ئەگەر لێم رژبکردایە طەرەفە وشکەکەی ئەیخواردەوە . فەرمووی : بچۆ بۆم بێنـە ، چـووم هێنامە خدمەتی ، کونەکەی بە دەستەوە گرت دەستی کرد بە شتێ ئەیخوێند نەمزانی کە چیی بوو ، بە هەردوو دەستی کونەکەی ئەگوشی لـە دواییا کونەکەی دایە دەستم فەرمووی : یا جابیر بانگ کـە تـەشـــتێ بێنـن بانگم‌کرد : ئەی تەشتی قەوم! تەشتێکیان هێنا هەڵئەگیرا [ لەبەر گەورەیی چەند کەسێ هەڵیان ئەگرت ] هێنرا دامنا لەبەر دەستی پێغەمەرا ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ لە تەشتەکـــەدا بە دەستی موبارەکی وای‌کرد [یەعنی] دەستی درێژکرد پەنجەی موبارەکی بڵاوکردەوە ، لە بن تەشتەکەدا دایناو فەرمووی : یا جابیر کونەکە بگرەو ئاوکە بەسەر دەستما بڵێ (بسم‌الله) ئاوم کرد بەسەر دەســتی موبارەکیاو وتم : (بسم الله ) دیم کە ئاو لە بەینی پەنجە موبارەکەکانیا هەڵەقولا ! لـــە دواییا تەشتەکە ئاوی لێ هەڵقولاو دەورەی ئەدا تا پڕ بوو ، فەرمووی :

ئەی جابیر بانگ کە کێ ئیحتیاجیی بە ئاو هەیە بێ • جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : خەڵق هاتن ئاویان خواردەوە تا تێراو بـوون • فەرمووی : وتم : کەسێ ماوە کە ئیحتیاجیی بە ئاو بێ ؟ [ یەعنی کەس نەمابوو ] پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ دەستی موبارەکی لەسەر تەشتەکە هەڵبڕی تەشتەکە ئێشتا پڕ بوو !

ئاوێکی زۆر کەم کە ئەوەندە نەبێ لە دەرکی کونە بێتەخوارێ بـــە بەرەکەتی دەسـ تیموبارەکیو بە دۆعای موبارەکی ئەوەندە زۆر بوە کـە ئیحتیاجیی لەشکرێکی پێ دەفع بوە !

وشكا الناس إلى رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ الجوع ، فقال : عسى الله أن يطعمكم فأتينا سيف البحر [ساحله] فزخر البحر زخرة [علا موجه] فألقى دابة فأوْرَيْنا [أوقدنا] على شقها النار فاطبخنا واشتوينا وأكلنا حتى شبعنا • قال جابر : فدخلت أنا وفلان وفلان حتى عد خمسة في حِجاج عينها [عظمها المستدير بها] مايرانا أحد حتى خرجنا فأخذنا ضلعا من أضلاعه ، فقوسناه ثم دعونا بأعظم رجل [ قيس بن سـعد بن عبـادة ـ رضي الله تعالى عنهما ـ] في الركب ، وأعظم جمل في الركب ، وأعظـم كِفْل [الكساء الذي يحويه راكب البعير على سنامه لئلا يسقط فيحفظ الكفل الراكب ] في الركب فدخل تحته مايطأطيء رأسه م ـ ١٠/٤٤٤ـ٤٦٠، ح ـ ٤١٢/٦ وفيه جود قيس وأبيه ـ رضي الله تعالى عنهما ـ •

**تەرجەمە :**

خەڵق شکاتی برسێتییان کرد لە خدمەت پێغەمەرا ـ صلى الله تعـالى عليه وسلم ـ فەرمووی : ئومێدم وایە کە خوا ـ عز وجل ـ طـەعامتـان دەرخوارد بدا ، هاتینە کەناری بەحرەوە ، بەحرەکە شەپۆلێکی دا حەیوانێکی

فرێدایەدەرێ ، لەسەر لایەکی ئاگرمانکردەوە ، کولاّنمان ، بـرژانمان ، خواردمان تا تێر بووین •

جابیر ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : منو فلاّنو فلاّنو ••• پێنج کەسی ژمارد ، چووینە ناو کالانەی چاویەوە تا هـاتینـەدەرێ کـەس نەیئەبینین • پەراسوویێکمان هێنا وەك کەوان چەمانمانەوە، لە لەشکرەکەدا کام پیاو گەورە بوو =کە قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە بو ـرضي الله تعالی عنهـ = بانگمانکرد ، کام وشتر لە لەشکرەکـەدا گەورە بـوو هێنامان ، کام کۆپان لە هەموویان گەورەتر بوو لە ناو کۆپانی وشترەکانا هێنامان ،[1] چوە ژێر ئەو پەراسوەوە سەری دانەدەنەوان •

ئەمەیش موعجیزەیێکی گەورەی پێغەمەرە ـ صلی الله تـعالی علیـه وسلم ـ کە ( قبل الوقوع )[2] خەبەری لێداوە •

وهذه القطعة الأخيرة من هذا الحديث بدون ذكر المعجزة عن جـابـر ـ رضـي الله تعـــالى عنـــه ـ في ح ـ ١٢٧/٥ و ح ـ ٤١٢/٦ و ٤١٣ و م ـ ١٥١/٨ ، ١٥٣ وفيها كان الركب ثلاثمائة ، وأميرهم أبو عبيدة الجراح، وليس فيهم النبي ـ عليه الصـــلاة والســـلام ـ وليس فيها الشكايـة إلى رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تذكر في مواقعها ـإن شاء الله[3]•

(١) واتە ئەو پیاوە گەورە سواری ئەو وشترە گەورە کۆپانبەرزە بوو •••

(٢) واتـە پێش رووداني کارەکە •

(٣) دانەر ـخـ تەرجەمەی ئەم قسەی سەرەوەی نەکردوە ئـەمە تێبینیی خۆیەتی ، ئەفەرموێ : ئەم پارچەی دواییە لە جابیرەوە ریوایەتکراوە بێ باسی موعجیزە ، لە چەند شوێنێکا ، لە یەکێك لەو شـوێنانەدا : سوپاکە (٣٠٠)کەس بوونو، ئەبوعوبەیدە سەرکردەیان بووو ، پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ لە ناویانا نەبوو ، باســی داوای لــە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـی تیا نیە • پشت بـە خوا لــە شوێنی خۆیا دێت •

٥٦٨/٣٠ ـ عن أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : أصـابت الناس سنَةٌ على عهد النبي ـ صلى الله تعالى عليـــه وسلم ـ فبينما النبـي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يخطب في يوم جمعة قام أعرابي فقـــال : يا رسول الله [ هلك الكراع وهلك الشاء فادع الله أن يسقينا فمدّ يـديـه ودعا ح ـ ١٧٩/٢ ] هلك المال وجاع العيال فادع الله لنا ، فرفع يـديـه [ حتى رأيت بياض إبطيه • ح ـ ٢٤١/٢ ] [ورفع الناس أيـــديهم معــه ح ـ ٢٤٠/٢] وما نرى في الســماء قَزْعة [قطعة من سحاب] فوالذي نفسي بيده ماوضعها حتى ثار السحاب أمثال الجبال ، ثم لم ينزل عن منبره حتى رأيت المطر يتحادر على لحيته ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ! فمطـرنـا يومنا ذلك ومن الغد وبعد الغد والذي يليه حتى الجمعة الأخرى ، وقام ذلك الأعرابي أو قال غيره فقال : يارسول الله تهدّم البناء وغرق المـــال فادع الله لنا • فرفع يده فقال : اللهم حوالينا ولا علينا فما يشير بيده إلى ناحية من السحاب إلا انفرجت وصارت المدينة مثل الجوبة [ الفـرجـــة المستديرة من السحاب ] وسال الوادي قَناةُ شهرا ، ولم يجيء أحد من ناحية إلا حدّث بالجود ح ـ ١٨٠/٢ ، م ـ ٢٢٠/٤ ، ن •

**٥٦٩/٣١ ـ وعنه يَذكر أن رجلا دخل يوم الجمعة من بابٍ كان وجاهَ المنبر [ نحو دار القضاء ، م ، خ أخرى ] ورسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قائم يخطب ، فاستقبل رسول الله قائما فقال : يا رسول الله هلكت المواشي وانقطعت السبل ، فادعالله يغيثنا [أن يسقينا • أخرى خ] قـــال : فرفع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يديـه فقال : اللهم اسقنا ، اللهم اسقنا [ وفي رواية بعده : اغثنا في المواضع ] اللهم اسقنا • قال أنس: ولا والله مانرى في السماء من سحاب ولا قزعة ولا شـيئا ، وما بيننا وبين سلع [ جبل بالمدينة ] من بيت ولا دار ، قال : فطلعت من ورائه سحابة مثل الترس ، فلما توسطت السماء انتشرت ، ثم أمطرت [فمطرنا فما كِدنا ان نصل إلى منازلنا ، فما زلنا نمطر الى الجمعة المقبلة •خ اخرى] قال [ فـلا• خ اخرى] والله مارأينا الشمس ستا [ سَبْتا م ـ ٢١٩/٤] ثم دخل رجل من**

**ذلك الباب في الجمعة المقبلة ورسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قائم يخطب فاستقبله قائما ، فقال : يا رسول الله هلكت الأموال ، وانقطعت السبل فادع = الله = يمسكها . قال : فرفع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليـــه وسلم ـ يديه ثم قال : اللهم حوالينا ولا علينا ، اللهم على الإكام [بمد الهمزة وكسرها ] والجبال ، والظراب [جمع ظَرِب : جبل منبسط على الأرض ] و [بطون . أخرى خ] الأودية ، ومنابت الشجر [ فانجابت عن المدينة انجيــاب الثوب . اخرى خ ] قال : [ فأقلعت . اخرى خ ] [ قـــال : فلقد رايت السحاب يتقطع يمينا وشمالا يُمطرون ولا يُمطر اهل المدينة .اخرى خ ] فانقطعت وخرجنا نمشي في الشمس قال : شريك : فسألت أنســـا : اهـــو الرجل الأول ؟ [ فقال : ما ادري . اخرى خ ] قال : لا أدري ح-٢/٢٣٠، ٢٣١ ، م - ٢١٦/٤ ، د ، ن .**

٣٢/٥٧٠ ـ عن ثابت عن أنس - رضي الله تعالى عنه ـ قال : كـــان النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يخطب يـوم جمعة ، فـقام النـاس فصاحوا ، فقالوا : يارسول الله قحط المطر ، واحمرت الشجر ، وهلكت البهائم ، فادع الله يسقينا . فقال : اللهم اسقنا مرتين . وأيم الله مانـرى في السماء قزعة من سحاب ، فنشأت سحابة وأمطرت ، ونـزل عـن المنبـر فصلى ، فلما انصرف فلم تزل تـمْطِرُ إلى الجمعة التي تليها . فلما قـام النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يخطب صاحوا إليه تهدمت البيوت ، وانقطعت السبل فادع الله يحبسها عنا فتبسم النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ثم قال : اللهم حواليْنا ولا علينا ، فكشطت [معلوما ومجهولا أي تكشفت] المدينة ، فجعلت تَمْطُر [من الأول أو الإفعال] حولها ولا تمْطُر بالمدينة قطرة . فنظرت إلى المدينة وإنها لفي مثل الإكليل [ما أحاط بالشيء روضة مكللة محفوفة بالنور وعصابة تزين بالجوهر ، ويسمى التاج إكليلا] ح ـ ٢/٢٣٧ ، م ـ ٢٢٠/٤ .

في البخاري روايات كثيرة نقلت منها ثلاثة ، وأشرت إلى مافي البقية من الفروق اليسيرة اكتفاء ، لأن الحادثة واحدة والراوي أنس ـ رضـي

پێکەنیم بەو پێکەنینەی کە تۆ دیت • ئەمە تەرجەمەی حەدیثی ح ـ۹/۱۵۸ • م ـ ۹/۳۵۹یـە •

لە ح ـ ٦/٦٥لەم حەدیثەدا سەبەبی گریانەکەی دوو شتە یەکێـکی ئەودیە نووسراوە • یەکێکی ئەوەیە کە بە حەزرەتی فـاطیـمە ـ رضي الله تعالى عنهاـی فەرموو : تۆ ئەوەڵ ئەهلی کەسێکی کە لە ئەهـلو بەیتم ئەگـەی بـە من •

لە حەدیثە موختەصەرەکەدا ئەفەرموێ : سەبەبی گریانی خـەبـەری وەفاتیە ،سەبەبی پێکەنینی خەبەری پێگەیینیەتی بە پێغەمـەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە پێش هەموو ئەهلی بەیتیا • خۆلاصە پێغەمەر ـصلى الله تعالى عليه وسلم ـ خەبەری وەفاتی خۆیی داوە ، خـــەبەری وەفاتـی حەزرەتی فاطیمەیشی داوە لە دوای خۆی لە پێش هەموو ئەهلی بـەیتـا هەردووکی (كما هو) واقیع بوە • ئەم دوو خەبەرە موعجیزەن• سەبەبـی گریانو پێکەنین یا قسەی مەسرووقە یا قســـــەی عوروەیە ؛ چـونکـی ئیختیلافیان لە غەیری فەرموودەی پێغەمەرایە ـ صلى الله تـــعالى عليـــه وســــلم ـ •

حوکمی ئەم حەدیثانە کە هەموو یەك واقیعەیە ، وجووبی کـەتمـانی سیڕی گەورەیە •

دڵخۆشیدانەوەو موژدەیشی تیا هەیە بۆ حەزرەتی فاطیمە ـ رضـي الله تعالى عنها ـ •

٥٩٥/٥٧ ـ عن جابر ـ رضي الله تـعالى عنه ـ قال : قـال النبـي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ [لي لما تـزوجت] : هل لكـم من أنماط ؟ [ خاڵی ریشوودار لە ئاوریشم ]• [ضرب من البسط له خمل رقيق] قلت : وأنى يكون لنا الأنماط ؟ قال : أما إنه سيكون لكم الأنماط • فأنا أقـول

لها ، يعني امرأته [سهلة بنت سعد] : أخرِّي عنا أنماطك . فتقول : ألـم يقل النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ إنها ستكون لكم الأنماط ؟ فأدَعها [ مفروشة ] ح - ٦٧/٦ .

**تەرجەمە :**

جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ [لەو وەختەدا كە لەگەڵ سەهلە ئیزدیواجم كرد] فەرمووی : خاڵیچەتان هەیە ؟ عەرزم‌كرد : ئێمە لە كوێ خاڵیچەمان ئەبێ ؟ فەرمووی: لەمەولا خاڵیچەتان ئەبێ . ئێستە بە ژنەكـەم ئەڵێم : خاڵیچەكەتمان لێ دوورخەرەوە ، ئەویش ئەڵێ : بۆ پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ نەیفەرموو كە لەمەولا خاڵیچەتان ئەبێ ؟ ئەو وەختە وازی لێ یێنم چـۆن داخراوە هەروا بمێنێتەوە .

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وەكوو چۆن خەبەری بـەوە داوە كە ماڵی جابیر ئەنماطیان ئەبێ بەو نەوعە فەرموودەكەی واقیع بوە .

بۆ ژنان فەرشی ئاوریشم ڕاخستن دروستە ؛ چونكی پێغەمەر ـصلى الله تعالى عليه وسلم ـ نەهی نەكردوە لە جـابیـر كە بووتان رای‌مەخەن . سەهلە بەوە جـابیری ئیقناع كـردوەو ئەویش وازی لێ هێنـاوە (من القسـطلاني ) .

٥٩٦/٥٨ ـ سعيد بن المسيب [رضي الله تعالى عنه ، ورحمه الله] قال: أخبرني أبو موسى الأشعري [رضي الله تعالى عنه] أنه توضأ في بيته ، ثم خرج فقلت : لألزَمنَّ رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ولأكونَنَّ معه يومي هذا . قال : فجاء المسجد فسأل عن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقال : خرج ووجَّهَ ههنا ، فخرجت على إثْره أسـأل عنـه حتى دخل بئر أريس [بستان بالقرب من قباء] فجلست عند الباب ، وبابها من

جريد ، قضى رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ حاجـته فتوضــأ فقمت إليــه •

**تەرجەمە :**

جابیر - رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : له ماڵەوه دەزنوێژم شـت چوومه دەرێ وتم : ئیمڕۆ لازمی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئەبم ، لێی جوێنابمەوه ، چوومه مزگەوت پرسیم که پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەشریفي لە کوێیە ؟ وتیان : تەشریفی چۆته دەرەوەو ڕووی کردۆته ئەو طەرەفه ، منیش به شوێنیا ڕۆییمو ئەمپرســیی ، تـا تەشریفی چوه باغی ئەریسەوه ، که بیرێکی تیایــه ، لای دەرگاکـەیـەوه دانیشتم ، دەرگاکەی لە لقی خورمایه ، تا پیغەمەر ـ صلى الله تعالى عليــه وسلم ـ قەضای حاجەتی کردو دەزنوێژی شت ، هەڵســـــامو چـوومه خـدمـەتـی •

فإذا هو جالس على بئر أريس ، وتوسط قُفَّها ، وكشف عن ساقيه، ودلاّهما في البئر ، فسلمت عليه [سلامُ الله وصلاتُه] ثم انصرفت فجلست عند الباب ، فقلت : لأكوننَّ بوّاب رسول الله ـ صلى الله تـعالى عليـــه وسلم ـ اليوم • فجاء أبوبكر [الصديق ـ رضي الله تعالى عنه ـ] فـدفـع الباب ، فقلت : من هذا ؟ فقال : أبوبكر : فقلت على رِسْلِك [ تمهَّلْ وتأنَّ ] ثم ذهبت فقلت : يارسول الله هذا أبوبكر يستأذن • فقال : ائذن له وبشِّره بالجنة • فأقبلتُ حتى قلت لأبي‌بكر : ادخل ورسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يُبَشِّرُكَ بالجنة • فدخل أبوبكر [رضي الله تعالى عنه] فجلس عن يمين رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ معه فـي القُفِّ [حافة البئر أو الدكَّة المحيطة] بها ودلَّى رجليه في البئر كما صنع النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وكشف عن ساقيه :

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ تەشریفی لەسەر بیری ئەریس دانیشتبوو لە ناوەڕاستی حەلقەی بیرەکە ، قاچی موبارەکی هەڵماڵیبوو دای‌هێشتبوە ناو بیرەکەوە ، سەلامم لێ‌کردو گەڕامەوە لای دەرگاکەوە دانیشتم ، وتم : ئیمڕۆ من ئەبم بە قاپیەوانی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالی عنه ـ تەشریفی هات پـاڵی نـا بە دەرگاکەوە . وتم : ئەوە کێیە ؟ فەرمووی : ئەبوبەکرم . وتم : جارێ صەبر کە لە دواییا چوومە خدمەت پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ عەرزم‌کرد : (یا رسول الله) ئەوە ئەبوبەکرە ئیذن ئەخوازێ . فەرمووی : ئیـــذنی بدەو موژدەی بەرێ بە بەهەشـــت . رووم‌کردەوە دەرگاکە تا بە ئەبوبەکر ـ رضـــي الله تـــعالی عنه ـم وت وەرە ژووریێو پێغەمەر ـ صلی الله تعـالی علیـه وسـلم ـ موژدەت ئەداتێ بە بەهەشت . ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالی عنه ـ تەشریفی چـوە ژوورێ لای راســـتی پێغەمەرەوە ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ لە خـــدمەتیا لـە نـاو بازنەی بیرەکەدا دانیشت‌و قاچی هەڵماڵی‌و دای‌هێشتە ناو بیرەکەوە وەکوو پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ کە کردی .

ثم رجعت فجلست وقد تركت أخي [أبو بردة ، أو أبو رهم] يتوضأ ويلحقني ، فقلت : إن يرد الله بفلان خيرا ، يريد أخاه ، يأت بـه ، فأذِن إنسان يحرك الباب فقلت : من هذا ؟ فقال : عمر بن الخطاب . فقلت : على رِسلك ، ثم جئت إلى رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فسلمت عليه ، فقلت : هذا عمر بن الخطاب يستأذن ، فقال : ائذن له وبشره بالجنة ، فجئت فقلت : ادخل وبشرك رسول الله ـ صلى الله تعالى عليـه وسلم ـ بالجنة ، فدخل فجلس مع رسول الله ـ صلى الله تعـالى عليـه وسلم ـ في القُفِّ عن يساره ودلى رجليه في البئر :

**تەرجەمە :**

لە دواییا گەڕامەوە بۆ لای دەرگاکەوە دانیشتم ، براکەمم = کــە ئەبوبوردە . یا ئەبوڕوهم بوە = بەجێهێشتبو کە دەزنوێژ بشواو بمگاتێ. وتم : ئەگەر خوا ئیرادەی خێری کــردبێ بە فلان ، یەعنــی براکەی ، ئەیهێنێ کەچی یەکێ دەرگاکەی بزاوتەوە ... تەرجــەمــەی باقیەکــەی وەکو پێشـــوە .

ثم رجعت فجلست ، فقلت : إن يرد الله بفلان خيرا يأت به . فجاء إنسان يحرّك الباب فقلت : من هذا ؟ فقال : عثمان بن عفان . فقلت : على رسلك ، فجئت إلى رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فـأخبـرتـه [زاد أبو عثمان فسكت هنَيْهة ] فقال : ائذن له وبشرّه بالجنــة على بلوى تصيبه ، فجئته فقلت له : ادخل وبشرك رســول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بالجنة على بلوى تصيبك [زاد أبو عثمان : فحمد الله، ثم قال : الله المستعان ] فدخل ووجد القُفّ قد ملىء فجلس وجـاهــه من الشـق الآخر . قــال شـريك : قــال سـعيد بن المسيب : فأولتها قبورهم ح ـ ٦/٩١ ، ١٠٢ ، ح ـ ٩/١٨٤ ، م ـ ٩/٢٩٢ :

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـصلیاللهتعالیعلیهوسلمـ کە خەبەری ئیمامی عوثمانی عەرزکرا نەختێ بێدەنگ بوو لە دواییا فەرمووی : ئیذنی بدەو موژدەی بـدەرێ بە بەهەشت لە سەر موصیبەتێ کە تووشی ئـــەبێ . کە ئەم فـەرموودەی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ خەبەر درا بە ئیمامی عوثمان ـرضي الله تعالی عنه ـ حەمدی خوای کردو لە دواییا فەرمووی : هەر خـوایـە موعاوەنەتی لێ طەلەب ئەکرێ، تەشریفی چوە ژووریۆ دەوری بیرەکـەی پڕ دی بە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـو دوو یاری (فيالروضة)ی

بەرابەریان ، لەوبەرەوە دانیشت • سەعید ئەفەرموێ : تەئویلم بە مەرقەدی موبارەکیان لێدایەوە کە دوو ئیمام لە خدمەتیان ئیمامی سێیەم لە بەقیعایە ـ رضي الله تعالى عنهم ، وصلى الله تعالى على النبي المصطفى أولا وآخرا ـ •

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ خەبەری دا بە فیتنەی حەزرەتی عوثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ وەك فەرمووی واقیع بوو •

**حـوکمی :**

دەرگاوانیی‌و راگرتنی دروستە •

ئیذن‌خواستن لازمـە •

بە ئەنی رەزا چوونە ناو مولکی غەیر دروستە •

پووزو قاچ‌و قول عەورەت نیە • کەسێ بچێتە لای یەکێ سونـەتـە سـەلامی لێبکا •

تەمەنناى خێر بۆکەس‌و کار سوننەتە • چونکی جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە خۆیەوە ئەو تەمەنناى نەکردوە کە براکەیشی لەو بەرەکەتـە مەحرووم نەبێ •

٥٩/٥٩٧ ـ عن أبي موسى [ قال البخـاري ] أراه [ وفي مسلم عن أبي موسى عن النبي ـ صلى الله تعـالى عليـه وسلم ـ بالجزم ] عن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : رأيت في المنام أني أهاجر من مكـــة إلى أرض بها نخل ، فذهب وَهْلي [وهمي] إلى أنها اليمامـــة أو هَجَر [مدينة باليمن] فإذا هي المدينة يثرب ، ورأيت في رؤياى هذه أني هزَزْت سيفا فانقطع صدره [وعند ابن اسحاق : ورأيت في ذباب سيفي ثلما] فإذا هو ما أصيب من المؤمنين يوم أحد • ثم هزَزْته بأخرى فعـاد أحسـن ماكان ، فإذا هو ماجاء الله به من الفتح واجتماع المؤمنين ورأيت فيها بقراء

والله خَيْر" ، فإذا هم المؤمنون يوم أحد ، وإذا الخير ماجاء الله من الخير وثواب الصدق الذي آتانا الله بعد يوم بـدر ح ـ ٦/٦٤ ، م ـ ٩/١٢٩ • ن ، جــه •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ئەفەرموێ : له خەوما دیم که هیجرەت ئەکەم له مەککەوە بۆ جێیێکی خورمادار ، له ئەوەڵەوە ذیهنم وا رۆیی که یەمامەیه ، یا هەجەرە ، کەچی مەدینه بوو • هەر لەو خەوەمـا دیم که شیرێکم راوەشان [که ذولفەقار بوو ] سنگی شیرەکه لەت بوو، کەچی تەئویلەکەی ئەوە بوو له غەزای ئوحودا تووشی موسوڵمانان بوو • لـــه دوایيا شیرەکەم جارێکی تر راوەشان له پێشووی چاکتر بۆوە • تەئویلی ئەو فەتحه بوو که خوا بۆی هێناین ، کۆبوونەوەی موسوڵمانان بـوو ، ئیصلاحی حاڵیان بوو • هەر لەو خەوەدا چاوم به گاجووت کەوتو ( والله خیر") [ یەعنی له خەوەکەما لەفظی (والله خیر)م بیست] به گوێدا هات ، کەچی ئەو گاجووته موسوڵمانان بوون له رۆژی ئوحودا که شەهید کران• ئەو خەیرەیش ئەو خەیرو راستیه بوو که خوا له دوای رۆژی بەدر بـۆی هێنـایـن •

ئەم حەدیثه دەلالەت ئەکا له صیدقی خەوی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ که هەمووی یەکه ـ یەکه هاتۆته دی •

ئەم حەدیثه موناسبی بابی روئیایشه ، هەوەســتان هەیه لـەوێیدا بنووســـــن •

٥٩٨/٦٠ ـ عن ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ أن النبي ـصلى الله تعالى عليه وسلم ـ دخل على أعرابي [قيس بن أبي حازم] يعوده =فقال= وكان النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ إذا دخل على مريض يعوده قال:

لا بأس طهور إن شاء الله • فقال له : لا بأس طهور إن شاء الله • قـال : قلت طهور ؟ كلا • بل هي حمّى تفور أو تثور [ شك من الراوي] عـلى شيخ كبير تزيره القبور • فقال النبي ـ صلى الله تعالى عليـه وسـلم ـ : فنعم إذاً ح ـ ٦١/٦ ، ن • وزاد الطبراني : أن النبي ـ صلى الله تعـالى عليه وسلم ـ قال للأعرابي : إذا أبيت فهي كما تقول ، وقضاء الله كائن • فما أمسى من الغد إلا ميتا •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەشریفی عەیادەتی عەرەبێکی بەڕێانی کرد • عادەتی پێغەمەریش ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وابـوو کە تەشریفی بچوایە بۆ سەردانی نەخۆشێ ئەیفەرموو : زەرەری نیـە (إن شاء الله) لە گوناهت پاك ئەکاتەوە ، بەویشی فەرموو • عەرەبەکە وتی: ئەفەرمویت طەهوورە ؟ حاشا طەهوور نیە ، بەڵکو ئەو نەخۆشییە تایێکە گڵپەی لێ هەڵەستێ لەسەر پیرێکی زۆر پیرە زیارەتی قەبری پێ ئەکا • پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : کە بەوە رازیی نیـت با وابێ کە وتت ، قەزای خوا هەر ئەبێ ببێ • عەرەبەکە نەکەوتە سبەینێ مرد • ( صدق رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ) •

دڵخۆشیدانەوەی نەخۆش سوننەتە •

لە دوای قسەیێکەوە کە ئینسان بڵێ وا ئەبێ (إن شـاء الله) کـردن سـوننەتـە •

٥٩٩/٦١ ـ عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : كان رجل [ من بني النجار •م] نصرانيا فأسلم وقرأ البقرة وآل عمران ، فـكان يـكتب للنبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فعاد نصرانيا فكان [لعنه الله] يقول : ما يدري محمد إلا ماكتبت له [كذب عدو الله] فأماته الله • فدفنوه فأصبح

وقد لفظته الأرض ! فقالوا : هذا فعل محمد وأصحابه لما هرب منهم نبشوا عن صاحبنا فألقوه • فحفروا له فأعمقوا ، فأصبح وقـد لفظتـه الأرض ! فقالوا : هذا فعل محمد وأصحابه نبشوا عن صاحبنا لماهرب منهم ، فألقوه فحفروا له فأعمقوا له في الأرض مااستطاعوا ، فأصبح قد لفظته الأرض ! فعلموا أنه ليس من الناس فألقوه ح ـ ٦/٦٢ ، م ـ ١٠/٢٥٨ بفرق ما وفيه: فانطلق هاربا حتى لحق بأهل الكتاب • قال : فرفعوه قالوا : هذا قـد كان يكتب لمحمد فأعجبوا به ، فما لبث أن قصم الله عنقه فيهم • فحفروا له فوارَوه ، فأصبحت الأرض قد نبذته على وجهها ، ثم عادوا فحفروا له فواروه ، فأصبحت الارض قد نبذته على وجهها • ثم عادوا فحفروا لـه فواروه ، فأصبحت الأرض قـد نبذته على وجهـا ! فتركـوه منبـوذا ! م ـ ١٠/٢٥٨ •

**تەرجەمە :**

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پیاوێ بوو نەصرانیی بوو [ لە بەنی نەججار •م] موسوڵمان بوو ، بەقەرەو ئـالی عیمرانی خـوێند • وەحیی بۆ پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ئەنووسیی ، بوەوە بـە نەصرانیی [هەڕای کرد تا ئیلتیحاقی کرد بە ئەهلی کیتاب پایەیان بەرزکردەوە، وتیان : ئەمە بۆ محمدی ئەنووسیی ، لایان عەجائیب بوو ، ئەوەندەی پێ نەچوو خوا ملی شکانو تۆپانی •م] دفنیان کرد ، کە سبەینێ بۆوە ئـەرز فڕێیدابوە دەرێ ! وتیان : ئەمە ئیشی محمدو ئەصحابیەتی کـــە لەوان هەڕای کرد قەبری رەفیقەکەمانیان هەڵداوەتەوەو فڕێیانداوەتە دەرێ • دووبارە بۆیان هەڵکەند زۆریان قووڵ کرد کە ســـبەینێ بـۆوە ئـەرز هاویتبوویە دەرێ ! وتیان : ئەمە فیعلی محمدو ئەصحابیەتی کە هەڕای کرد لێیان قەبرەکەیان هەڵداودتەوەو فڕێیانداوەتە دەرێ • سـێبارە بـۆیـان

هەڵکەند تا توانییان قەبرەکەیان بۆ قووڵ کرد ، کە سبەینێیان لێ بۆو ، ئەرز هاویتبوویە دەرێ ! ئەمجا زانییان کـە ئـەوە ئیشی ئینسان نیەو لـە طەرەفی خواوەیە ، فڕێیانداو بەو نەوعە بەجێیان هێشت !

سێ دەفعە ئەرزی بێ رۆح شەقبەرێتو مردوو فڕێداتە دەرێ هەر لە قودرەتی خوادایە !

لە موعجیزات ئەم میقدارە بەسە ،چونکی موعجیزە یەکجار زۆرە لە ئەکثەری ئەم بابانەی کە (إن شاء الله) لەمەولا یێت زۆر موعجیزەیان تیـا هەیە . (مثلا) میعراج موعجیزەیە ، ئەشراطی ســـاعەت ، فیتەن هـەموو موعجیزەن ، لە حەدیثی هیجرەتا موعجیزەی سوراقەی تیایە ـ رضي الله تعـالی عنــه ـ

تـم[1] بحمد الله تعالی ما أردت أن أكتبه من معجزاته ـ عليه الصلاة والسلام ـ چارشەنبە ٩٤٠/٨/٧ ويليه معراجه ـ عليه الصلاة والسلام ـ.

---

(١) بە یارمەتیی خودا ئەوەی کە ویستم لە باســـــی موعجیزاتی پێغەمەرا ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ بینووسم تەواو بوو . چــوار شەنبەی ٩٤٠/٨/٧ باسی میعراجی بە شوێندا دێت .

## معراجه ـ عليه الصلاة والسلام ـ

**٨ / ٨ / ٩٤٠ پێنجشەنبە**

١/٦٠٠ ـ عن أنس بن مالك [رضي الله تعالى عنه] قال : كان أبوذر [رضي الله تعالى عنه] يحدث أن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : فُرِجَ [فُتِحَ] عن سقف بيتي [بيت أم هانىء] وأنا بمكة فنزل جبريل [عليه السلام] فَفَرَجَ صدري ثم غسله بماء زمزم ، ثم جاء بطست من ذهب ممتلىء حكمة وإيمانا ، فأفرغه في صدري ، ثم أطبقه ، ثم أخذ بيدي فعرج =بي= إلى السماء الدنيا = فلما جئت إلى السماء الدنيا = قال جبريل [عليه السلام] لخازن السماء : افتح . قال : من هذا ؟ قال : جبريل . قال : هل معك أحد ؟ قال : نعم معي محمد ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقال : أرْسِلَ إليه ؟ قال : نعم . فلما فُتِحَ علونا السماء الدنيا ، فإذا رجل قاعد على يمينه أسودة وعلى يساره أسودة ، إذا نظر قِبَلَ يمينه ضحك ، وإذا نظر قِبَلَ يساره بكى . فقال : مرحبا بالنبي الصالح والابن الصالح . قلت لجبريل : من هذا ؟ قال : هذا آدم [ عليه السلام ] وهذه الأسودة عن يمينه وشماله نَسَمُ بنيه ، فأهل اليمين منهم أهل الجنة ، والأسودة التي عن شماله أهل النار . فإذا نظر عن يمينه ضحك ، وإذا نظر قِبَلَ شماله بكى ، حتى عرج بي إلى السماء الثانية ، فقال لخازنها : افتح ، فقال له خازنها مثل ماقال الأول ففتح .

**تەرجەمە :**

ئەنەسی بنی مالیك ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : ئەبوذەڕ ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەیفەرموو : کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسـلم ـ فەرمووی : سەقفی خانوەکەمان [کە خانووی ئوموهانیئە ـ رضي الله تعالى عنها ـ] شەقیبرد من لە مەککە بووم ، جیبریل ـ عليه السـلام ـ لەوێوە هاتەخوارێ سنگی شەقکردم ، لە دواییا بە ئاوی زەمزەم شتی ، لە دواییا تەشتێکی ئاڵتوونینی هێنا پڕبوو لە حیکمەت‌و ئیمان ، کردیە نـاو سنگمەوە [ یەعنی دڵمەوە ، دڵیش لـە ناو سنگایە ( الماء في الكوز ) تەشتی ئاڵتوونین‌و پڕبوونی لە حیکمەت‌و ئیمان کە ئومووری مەعقوولەن تەمثیلەو تەشبیهی مەعقوولە بە مەحسووس ، موراد وایە موعامەلەیێکـی وای لەگەڵ قەلبی کردوە کە قوەتێکی وای تیا حاصل بوە بەو قـوەتـە ئیدراکی حیکمەت ئەکاو ئیمان‌و یەقینی کاملی تیا حاصل ئەبێ ، وەکـوو چۆن ئێمە ئەڵێین :ئینسان بەیانیان مێوژ یا شتی شیرین بخوا ذیهنی تیـژ ئەبێ ، وەکووچۆن ( لا مناقشة في التمثال ) سـەعات قوڕمیش ئەکـرێ موتتەخلەمەن ئیش ئەکا ، موثبەت‌و مەنفیی ئەلەکتریق کەوتە یەك نـوورو ضیاو ئەنواعی حەرەکەتی لێ یێتە وجوود ، حەزرەتی جیبریلیش ـ علیـه الصلاة والسلام ـ لەگەڵ قەلبی شەریفی پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليـه والسلام ـ موعامەلەیێکی وای کـردوە کە قەلبی مـوبارەکـی قووەت‌و تەحەممولی ئەوەی ببێ کە لە قووەتی بەشەرا نەبێ ] لە دواییا سـنگمی هێنایەوە یەك [دای‌خست‌و مۆری کرد کە غەیری ئەخلاقی حەمیدە رێـی هیچی تر نەبێ بچێتە ناوی ] لە دواییا دەستی گرتم‌و بردمی بۆ ئاسـمانی دنیا . کە هاتمە ئاسمانی دنیا ، جیبریل ـ عليه السـلام ـ بە خەزنەداری ئاسمانی فەرموو دەرگامان لێ وەکە . خەزنەدار فەرمووی : ئەوە کێیە ؟ فەرمووی : جیبریلم . فەرمووی : هیچ کەست لەگەڵ هەیە ؟ فەرمووی :

بەڵێ محمدم ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لەگەڵە • خازین فەرمووی : نێرراوە بە شوێنیا ؟ فەرمووی : بەڵێ • کـە دەرگاکە کرایەوە چـووینـە ئاسمانی دنیاوە پیاوێ دانیشتبوو بەعزێ شەخسی لای راستەوە بـوو ، بەعزێکی لای چەپەوە بوو =کە= تەماشای لای راستی ئەکرد پێ‌ئەکەنی، کە تەماشای لای چەپی ئەکرد ئەگریا [ یا خوا هەر بۆمان پێکەنێ قـــەت بۆمان نەگری !] •

فەرمووی : مەرحەبا بێ لە پێغەمەرێکی صالیح‌و کوڕێکی صالحم • بەجیبریل ـ علیـه السـلام ـم وت : ئەم پیاوە کێیە ؟ فەرمووی : ئەوە حەزرەتی ئادەمە ـ علیه السلام ـ ئەوانەی لای راست‌و چەپیەوەیە ئەرواحی ئەولادی ئەون ، هی لای راستی ئەهلی بەهەشتن ، هی لای چەپی ئەهلی جەهەننەمن ، کە تەماشای لای راستی ئەکا پێ‌ئەکەنێ ، تەماشای لای چەپی ئەکا ئەگـری •

جیبریل ـ علیه السلام ـ سەری‌خستم بۆ ئاسـمـانـی دوەم ، بـە خازینەکەی وت : دەرگاکەمان لێ‌بکەرەوە ، خازینی ئاسمانی ئەوەڵ چ گفتوگۆیێکی لەگەڵ جیبریل ـ علیـه السـلام ـکرد ئەمیش کردی ، دەرگەکەمان لێ کرایەوە •

قال أنس [رضي الله تعالى عنه] فذكر أنه وجد في السماوات : آدم ، وإدريس ، وموسى ، وعيسى ، وإبراهيم ـ صلوات الله عليهم ـ ولم يُثبت كيف منازلهم ، غير أنه ذكر أنه وجد آدم في السماء الدنيا ، وإبراهيم في السماء السادسة •

**تەرجەمە :**

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : ئەبوذەڕ ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە ئاسمانەکانا:

ئادەمو ، ئیدریسو ، مووساو ، عیساو ، ئیبراهیمی دی ـ علیهم الصلاة والسلام ـ مەنزلیانی کە لە چ ئاسمانێکا دیونی بەیان نەکرد، ئەوەندەی هەیە بەیانی ئەوەی کرد کە حەزرەتی ئادەمی ـ علیه السلام ـ لە ئاسمانی ئەوەڵا دی ، حەزرەتی ئیبراهیم ـ علیه السلام ـی لە ئاسمانی شەشەما دی ٠
[لە حەدیثەکەی دواییدا ئەفەرموێ : حەزرەتی ئیبراهیم ـ علیه السلام ـی لە ئاسمانی حەوتەمادی ئیحتیمالی هـەیـە ، حەزرەتی ئیبراهیمی ـ علیـه السلام ـ لە پێشا لە ئاسمانی شەشەما پێکەیی بێو لە دوایا لە ئاسـمانی حەوتەمیشا دیبێتی ] ٠

قال أنس [رضي الله تعالى عنه] فلما مر جبريل بالنبي ـ صلى الله تعالى عليهما وسلم ـ بإدريس [عليه السلام] قال : مرحبا بالنبي الصالح والأخ الصالح ٠ فقلت : من هذا ؟ قال : هذا إدريس [عليـه الســلام] ٠ ثم مررت بموســى [ عليه الســلام ] فقــال : مرحبـا بالنبـي الصـالـح والاخ الصــالــح ، قلت : مـن هـــذا ؟ قــال : هـذا موسى ، ثـم مررت بعيسى [عليه السلام] فقال : مرحبا بالأخ الصالح والنبي الصالح٠ قلت : من هذا ؟ قال =هذا= عيسى [عليه السلام ـ ثم في هـذا ليس للترتيب الحقيقي بل للترتيب الذكري ] ثم مررت بإبراهيم [عليه السـلام] فقال : مرحبا بالنبي الصالح والابن الصالح ٠ قلت : من هذا ؟ قال : هذا إبراهيم [عليه السلام] ح ـ ٣٧٤/١ ، ت ، ن ، م ـ ٧٥/٢ :

**تەرجەمە :**

ئەنەس ئەفەرموێ : کە حەزرەتی جیبریل پێغەمەری ـ صلى الله تعالى عليهما وسلم ـ بە لای حەزرەتی ئیدریسا رابوارد ، حەزرەتی ئـیدریس ـ علیه السلام ـ فەرمووی : مەرحەبا بێ لە پێغەمەرێکی صالحو براێکی صالح ٠ پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : لە جیبـریـل

ـ عليه السلام ـم پرسيى : ئەمە كێيە ؟ فەرمووى : ئيدريسە ـعليه‌السلام‌ـ پێغەمەرەكانى تريش بەو نەوعە مەرحەبايان لىَ‌كرد ، حەزرەتى ئيبراهيــم ـ عليه السلام ـ فەرمووى : مەرحەبا بۆ لە پێغەمەرێكى صالحو برايێكى كــورێكى صــالــح •

قال ابن شهاب : فأخبرني ابن حزم [أبوبكر بن محمد بن عمرو بن حزم الأنصاري ] أن ابن عباس وأباحبة [ البدري ـ رضي الله تعالى عنهما ] الأنصاري كانا يقولان : قال النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : ثـم عُرجَ بي حتى ظهرت لمستوى أسمع فيه صريف الأقلام • قال ابن حزم [بالسند عن شيخه] وأنس ابن مالك قـــال النبي ـ صلى الله تعالى عليـه وسلم ـ : ففرض الله على أمتي خمسين صلاة فرجعت بذلك حتى مررت على موسى [عليه الصلاة والسلام] فقال : ما فرض الله لك على أمتك ؟ قلت : فرض خمسين صلاة • قال : فارجع إلى ربك • فإن أمتك لا تطيق ذلـك فراجعني فوضع شطرها ، فرجعت إلى موسى [عليه السلام] قلت : وضـع شطرها ، فقال : راجع ربك فإن امتك لا تطيق ذلك ، فراجعت فـوضـع شطرها ، فرجعت إليه • فقال : ارجع إلى ربك فإن أمتك لا تطيق ذلك ، فراجعته فقال [جل وعلا] : هي خمس وهي خمسون ، لا يبـدل القـول لدي • فرجعت إلى موسى ـ عليه السلام ـ فقال : راجع ربك ، فقلت : استحييت من ربي ، ثم انطلق بي حتى انتهى بي إلى سدرة المنتهى ، وغشيها ألوان لا أدري ماهي ، ثم أدخلت الجنة فإذا فيها [جنابذ •م ، خ أخرى] حبائل اللؤلؤ وإذا ترابها المسك ح ـ ٣٧٦/١ ، م ـ ٧٨/٢ ، ت ، ن :

**تەرجەمە :**

ئــەم حـەديثە لە تەتيمەى حەديثەكەى پێشەوەيە • ئيبنوشەهابى زوهريى ئەڵێ : ئەبوبەكرى ، كوڕى محەمەدى ، كوڕى عەمرى ، كوڕى

حەزم خەبەری داومێ کە ئیبنوعەباس‌و ئەبوحەبیەی ئەنصاریی ـ رضي الله تعالی عنهم ـ ئەیانفەرموو : پێغەمەر ـ صلی الله تعـالی علیـه وسلم ـ فەرمووی : لە دواییا برامە جێگەیێکی (مستوی) یەعنی بڵند ، لـەوێـدا گوێم لە جیڕەی قەڵەمی مەلائیکە بوو کە موقەددەراتی ئیلاهییان ئەنووسی٠ ئیبنوحەزم لەشێخیەوە ، ئەنەسی بنی مالیك لە ئەبوذەڕەوە ـ رضي الله تعالی عنە ـ ریوایەت‌ئەکەن فەرموویان : پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : خوا ـ عز وجل ـ شەوو رۆژی پەنجا نوێژی لەسەر ئوممەتـم فەرزکرد ٠ بەو ئەمرەوە گەڕامەوە تا بە لای حەزرەتی مووسا ـ علیـه السلام ـا رابوردم فەرمووی : خوا چی لەسەر ئوممەتەکەت فەرزکرد؟ وتم: شەوو رۆژی پەنجا نوێژ ٠ فەرمووی : بگەڕێرەوە ئوممەتەکەت تاقـەتـی ئەوەیان نیە ٠ گەڕامەوە بۆ حوضووری خـوا ، بەعزێکی لێ‌داشکێنرا ، گـەڕامـەوە بـۆ لای حـەزرەتی مووسـا ـ علیـه السـلام ـ وتـم : بەعزێـکی لێ داشـکێنرا ٠ دیسـان ، دیسـان ٠٠ تـا لـە دەفعـەی ئـاخـریـدا خـوا فـەرمـووی : پێنـج نـوێـژە بـە پـەنجـا نوێژ حسێبە ، گەڕامەوە بۆ لای حەزرەتی مووسا ٠ فەرمووی : بگەڕێرەوە بۆ حوضوور ٠ وتم : [ئیتر] حەیام کرد لە خوای خۆم ، لە دواییـدا گەیێنرامە (سدرة المنتهی) گەلێ رەنگ دای‌پۆشیبوو نازانم چیە ٠ لـە دواییدا برامە بەهەشتەوە کە دیم لە بەهەشتا قوببە [روایة]و ریشـووی [ریوایة] دوڕو مرواریی تیا بوو ، کە دیم گڵی میسك بوو ، یەعنی یا میسکی حەقیقیی بوو ، یا بۆنی وەك بۆنی میسك وابوو ٠

ئەبوحەبیە ـ رضي الله تعالی عنە ـ لە غەزای ئوحودا شەهید بوو ، نـە ئەبوبەکر نە باوکی کە محەمەدە نەیان‌دیوە ٠ کە وابێ ئەم حـەدیثـە مونقەطیعە ٠ بۆچی موسلیمیش‌و بوخاریش ریوایەتیان کردوە ؟ مومکین

نيه ئەبێسەنەدێکی تری موتتەصیلی ببێ ، گینا ئەوان غەیری حـەدیثـی صەحیح ریوایەت ناکەن •

٦٠١/٢ ـ عن أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ ان رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : أتيت بالبراق وهو دابة أبيض طـويل فوق الحمار ودون البغل يضع حافره عند منتهى طرفه • قال : فركبته حتى أتيت بيت المَقْدِس ، قال : فربطته بالحلقة التي يربط به الأنبياء ، قال : ثم دخلت المسجد فصليت فيه ركعتين ، ثم خرجت فجاءني جبريل بإناء من خمر وإناء من لبن ، فاخترت اللبن ، فقال جبريل ـ عليه الســـلام ـ : اخترت الفطرة • قال : ثم عرج بنا إلى السماء ، فاستفتح جبريل ـ عليـــه السلام ـ فقيل : من أنت ؟ قال : جبريل • قيل : ومن معك ؟ قـــال : محمد ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قيل : وقد بعث إليه ؟ قال : قـــد بعث إليه • ففتح لنا فإذا أنا بآدم ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فرحَّب بي ودعا لي بخير • ثم عرج بنا إلى السماء الثانية ، فاســـتفتح جبريـل ـ عليه السلام ـ فقيل : من أنت ؟ قال : جبريل • قيـل : ومن معك ؟ قال : محمد • قيل : وقد بعث إليه ؟ قال : قد بعث إليه • قال : ففتـح لنا ، فإذا أنا بابني الخالة : عيسى بن مريم ويحيى بن زكـريا ، فرحَّبا بي ودَعَوَا لي بخير • ثم عرج بنا إلى السماء الثالثة ، فاستفتح جبريل ـعليه السلام ـ فقيل : من أنت ؟ قال : جبريل • قيل : ومن معك ؟ قال : محمد• قيل : وقد بعث إليه ؟ قال : قد بعث إليه • ففتح لنا ، فإذا أنا بيوسف [عليه السلام] إذا هو قد أعطي شطر الحسن • قال : فرحب بي ودعا لي بخير• ثم عرج بنا إلى السماء الرابعة • فاستفتح جبريل [عليه السلام] فقيل : من هذا ؟ قال : جبريل • قيل : ومن معك ؟ قال : محمد • قيل : وقـد بعث إليه ؟ قال : قد بعث إليه • ففتح لنا • فإذا أنا بإدريس [عليه السلام]

فرحب بي ودعا لي بخير • قال الله ـ عز وجل ـ: (ورفعناه مكانا عليا)[1] ثم عرج بنا إلى السماء الخامسة ، فاستفتح جبريل [عليه السلام] قيل : من هذا ؟ قال : جبريل • قيل : ومن معك ؟ قال : محمد [عليه الصلاة والسلام] قيل : وقد بعث إليه ؟ قال : قد بعث إليه • ففتح لنا ، فإذا أنا بهارون ـ عليه السلام ـ فرحب بي ودعا لي بخير ، ثم عرج بنا إلى السماء السادسة ، فاستفتح جبريل • قيل : من هذا ؟ قال : جبريل • قيل : ومن معك ؟ قال : محمد [عليه الصلاة والسلام] قيل : وقد بعث إليه ؟ قال : قد بعث إليه • ففتح لنا • فإذا أنا بموسى [عليه السلام] فرحب بي ودعا لي بخير • ثم عرج بنا إلى السماء السابعة ، فاستفتح جبريل ، قيل: من هذا ؟ قال : جبريل • قيل : ومن معك ؟ قال : محمد [عليه الصلاة والسلام] قيل : وقد بعث إليه ؟ قال : قد بعث إليه • ففتح لنا ، فإذا أنا بإبراهيم [عليه السلام] مسندا ظهره إلى البيت المعمور ، وإذا هو يدخله كل يوم سبعون ألف ملك لا يعودون إليه •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : بوراقم بۆ هێنرا ، بوراق حەیوانێکی سپیو درێژە لە بەینی گوێدرێژو ئێسترایە بە گەورەیی، چاوی تا کوێ بڕ ئەکا سمی لەوێ دائەنێ • سواری بووم تا چوومە (بیت المقدس) بوراقەکەم بەستەوە بەو حەلقەیەی کە پێغەمەران حەیوانی پێوەئەبەستن • لە دواییدا چوومە ناو مزگەوتەکەوە دوو رەکعەت نوێژم تیا کرد • لە دواییا هاتمەدەرێ • جیبریل ـ علیه السلام ـ هات پیاڵەیێ شەرابو پیاڵەیێ شیری بۆ هێنام ، ئیختیاری شیرەکەم کرد • فەرمووی: ئیختیاری فیطرەتی سەلیمەت کرد لە دواییا فەرمووی : سەرخراین بۆ

---

(١) مريم / ٥٧ •

ئاسمان • جيبريل ـعليه السلام ـوتى : دەر گاكەم لێ بكەنەوە • وتيان : تۆ كێى ؟ فەرمووى : جيبريلم • وتيان : كێت لەگەڵە ؟ فەرمووى : محمـد ـ صلى الله تعالى عليـــه وســـلم ـ • فەرموويان : نێرراوە بە شوێنيا ؟ فەرمووى : نێرراوە • دەرگامان لێ‌كرايەوە • بە ئادەم ـ عليه السلام ـ گەيين ، مەرحەباى لێ‌كردم ، دوعاى خێرى بۆ كردم • ئيتر بەم تەرتيبـە بۆ هەموو ئاسمانەكان تەشريفيان ســەركەوت لــە هەموو ئاســمانێ ئــەم سوئاڵ‌و جوابەيان لێ كرا ، پێى ناوێ هەمووى تەرجەمـە بكەم • لـــە ئاسمانى دوەمدا حەزرەتى عيساو يەحياى لێ‌بوو ، لە ئاسمانى سێيـەمـا حەزرەتى يوسفى لێ‌بوو ،نيوەى جوانيى مەخلووقاتى پێ عەطا كرابوو • لە ئاسمانى چوارەما حەزرەتى ئيدريسى لێ بوو ، لە ئاسمانى پێنجـەمـا حەزرەتى هاروونى لێ بوو ، لە ئاسمانى شەشەما حەزرەتى مووساى لێ بوو ، لە ئاسمانى حەوتەما حەزرەتى ئيبراهيمى لێ بوو ، پاڵى دابوەوە بە (بيت المعمور)ەوە ـ عليهم الصـــلاة والسلام ـ بەيتولمەعموور كوللى رۆژێ حەفتا هەزار مەلائيكە ئەچنە ناويەوە دەفعەيێكى تر ناچنەوە ناوى •

ثم ذهب بي إلى السدرة المنتهى ، وإذا ورقـها كـأذان الفيلة ، وإذا ثمرها كالقلال ، فلما غَشِيها من أمر الله ماغَشِيَ تغيرت ، فما أحد من خلق الله يستطيع أن ينعتها من حسـنها ، فأوحى إلي ما أوحى ، ففرض علي خمسين صلاة في كل يوم وليلة ، فنزلت إلى موسى [عليـه السلام] فقال : مافرض ربك على أمَّتك ؟ قلت : خمسين صلاة • قال : ارجـع إلى ربك فاسأله التخفيف ، فإن أمتك لا يطيقون ذلك ، فإني قد بلوت بني إسرائيل وخبَّرتهم • قال : فرجعت إلى ربي فقلت : يا ربي خفف على أمتي فحطَّ عني خمسا • فرجعت إلى موسى فقلت : حطَّ عني خمسا • قال : إن أمتك لا يطيقون ذلك • فارجع إلى ربك فاسألـه التخفيف •

قال : فلم أزل أرجع بين ربي تبارك وتعالى وبين موسى ـ عليه الســلام ـ حتى قال : يا محمد إنهن خمس صلوات كل يوم وليلة ، لكل صلاة عشر فذلك خمسون صلاة . ومن همّ بحسنة فلم يعملها كتبت له حسنة ، فـإن عملها كتبت له عشرا ، ومن هم بسيئة فلم يعملها لم تكتب شيئا ، فإن عملها كتبت سيئة واحدة . قال : فنزلت حتى =انتهيت إلى= موسى ـ عليه السلام ـ فأخبرته فقال : ارجع إلى ربك فاسأله التخفيف . فقال رسول‌الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ: فقلت : قد رجعت إلى ربي حتى استحييت منـه م ـ ٢/٦٦ :

**تەرجەمە :**

له دواییا برام بۆ (سدرة المنتهى)گەڵای وەکوو گوێی فیل وابــوو . بەری وەکوو جەڕڕە وابوو ، کە لە طەرەفی خواوە شتێکی درا بە سەراو داپۆشیی هیچ کەس نیە لە مەخلووقی خوا کە بتوانێ تەعریفی جوانیی بکا ئەوەندە جوان بوو . خوا ـ عز وجل ـوەحی ئەوەی کردمێ کە وەحــی کرد ، پەنجا نوێژی لەسەر فەرزکردم لە کوللی رۆژو شەوێکا ، هــاتمــە خوارێ لای مووسا ـعلیه السلام ـپرسیی : خوا چی لەسەر ئوممەتەکەت فەرزکرد ؟ وتم : پەنجا نوێژ . فەرمووی : بگەڕێرەوە طەلەبی لێ بکە کە لەسەریان سووك بکا ئوممەتی تۆ تاقەتی ئەوەیان نیە . من بەنی‌ئیسرائیلم زۆر تەجرەبە کردوە . فەرمووی : گەڕامەوە عەرزی بارەگای خوام کرد: کــە یارەبــی تــەکلیف لــەســـەر ئوممــەتــەکەم ســـــووك بکــە . پێنــج نــوێــژی لەســـــەر ســـــووك‌کردن . گـــەڕامـــەوە بــۆ لای مووســـا ـ علیــە الســـــلام ـ خەبەرم‌دایــە . فــەرمووی : بگەڕێرەوە بۆ حوزوور طەڵــەبی تــەخفیفی =لێ= بکە . ئیتر بەم نەوعە هەر لە بەینی خوا ـ جل شأنه ـو مووسا ـ علیه السلام ـا هاتوچۆم کرد تــا خــــوا فەرمووی : ئەی محمد نوێژ پێنجە لـــە کوللی رۆژو شــەوێکا ، هــەر نوێژی بە دە نوێژ حسێبە ، ئەوە پەنجا نوێژ ، هەرکەسێ قەصدی شتێکی

خێر بكاو نەیكا خێرێكی بۆ ئەنووسم ، ئەگەر كـردی دە خێـری بـۆ ئەنووسم • هەركەسێ قەصدی خراپەیێ بكاو نـەیكا هیچی لەســەر نانووسم ، ئەگەر كردی گوناهێكی لەسەر ئەنووسم • فەرمووی : لــە حوضووری بارەگا هاتمە خوارێ تا هاتمە لای مووسا ـ علیـه الصـلاة والسـلام ـ خەبەرم دایێ ، فەرمووی : بگەڕێرەوە لای حەزرەتی رەببت طەلەبی تەخفیفیی لێ بكە • پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وســـلم ـ فەرمووی : وتم : ئەوەندەم موراجەعەی بارەگا كرد تا حەیا گرتمی •

ئێمە پێنج نوێژ ناكەین ئەگەر پەنجا بوایە چیمان ئەكرد ؟! ( جـزی عنا نبینا محمدا ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ وموسی ـ علیه الصـلاة والسلام ـ جزاء یلیق بشأنهما عند الله ـ عز وجل ـ) •

٣/٦٠٢ ـ عن قتادة عن أنس بن‌مالك، عن مالك‌بن‌صعصعة ـرضي الله تعالی‌عنهماـ أن نبي الله ـ صلی‌الله‌تعالی‌علیه‌وسلم ـ حدثهم عن لیلة أسري‌به• قال : بینما أنا في الحطیم [أي في الحجر] وربما قال في الحجر [ شـك قتادة ] مضطجعا إذ أتاني آت فقدّ قال وسمعته [أي أنسا] یقول : فشق مابین هذه إلی هذه ، فقلت للجارود ، وهو إلی جنبي : مایعني به ؟ قال : من ثُغْرةِ نحره إلی شِعْرته • وســـمعته یقـول : من قَصّته [ رأس صدره ] إلی شِعْرته =فاستخرج قلبي= ثم أتیت بطست من ذهب مملوأة إیمانا ، فغُسِل قلبي ، ثم حُشِيَ ، ثم أعید ، ثم أتیت بدابة دون البغل وفوق الحمار أبیض • فقال له الجارود : هو البراق یا أبا حمزة ؟ قـــال أنس : نعم ، یضع خطوه عند أقصی طرْفه ، فَحُمِلت علیه ، فانطلـق بي جبریل حتی السماء الدنیا فاستفتح ، فقیل : من هذا ؟ قال : جبریل قیل : ومن معك ؟ قال : محمد • قیل : وقد أرسل إلیه ؟ قال : نعم • قیل : مرحبا به فنعم المجيء جاء ، ففتح • فلما خَلَصْت فإذا فیها آدم

[عليه السلام] فقال : هذا أبوك آدم ، فسلم عليه • فسلمت عليه فـرد السلام ، ثم قال : مرحبا بالابن الصالح والنبي الصالح :

**تەرجەمە :**

ئەنەسی بنی مالیك لە مالیكی بنی صەعصەعەوە ریوایەت ئەكا ـ رضي الله تعالی عنهما ـ كە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ بەحثی لە شەوی میعراج بۆ ئەكردن ، فەرمووی : لە حەطیما راكشابووم ، یەكێك هـات بەینی ئێرەو ئەوێمی شەق‌كرد • قەتادە ئەڵێ : جاروودم لە تەنیشتەوە بوو لێم پرسی : مەقصوودی ئەنەس ، یا هی پێغەمەر ـصلی الله تعالی علیه وسلمـ لەمە كە فەرمووی مابەینی ئێرەم تا ئەوێم چیە ؟ ئەنەس فەرمووی : لـــە چووڵەمەی سنگییەوە تا مووی ( ظهار )ی[1] دڵی دەرهێنام تەشـــتێكی ئاڵتوونینی پڕ لە ئیمانم بۆ هێنرا ، دڵم شۆررا پڕكرا لە ئیمانو حیكمەت • لە دواییا خستیەوە جێی خۆی • لە دواییدا حەیوانێكیان بۆ هێنام لە ئێستر بچكۆلەتر لە گوێدرێژ گەورەتر بوو ، چاری تا كوێ بڕیەكرد سمی لەوێ دائەنا • جاروود لە ئەنەسی پرســـی : ئەو حەیوانە بوراق بوو ؟ ئەنەس فەرمووی : بەڵێ سواری‌كرام • جیبریل ـ علیه الصلاة والسلام ـ بردمی تا ئاسمانی دنیا • فەرمووی : دەرگاكەم لێ‌بكەنەوە • پرسییان : ئـەوە كێیە ؟ فەرمووی : جوبرەئیلە • پرسییان : كێــــت لەگەڵە ؟ فەرمووی : محمد • پرسییان : نێرراوە بەشوێنیا ؟ فەرمووی : بەڵێ • فەرموویان : مەرحەبای لێ بێ • چ هاتنێكی باشـــە هاتنەكەی ئـــەو • هـات خازین دەرگاكەی كردەوە ، كە گەیمە ئەوێ تەشریفی حەزرەتی ئـادەم ـ علیـه السلام ـی تیابوو • جوبرەئیل فەرمووی : ئەمە حەزرەتی ئادەمی باوكتە

(۱) واتــە : تــا مووی بەری •

سەلامی لێ بکە ، سەلامم لێکردو ســــەلامی سەندمەوە ، فەرمووی : مەرحەبا بێ لە کوڕێکی صالحو پێغەمەرێکی صالح •

ثم صعد [بي] حتى أتى السماء الثانية فاستفتح • قيل : من هـذا ؟ قال : جبريل • قيل : ومن معك ؟ قال : محمد • قيل : وقد أرسل إليه ؟ قال : نعم • قيل : مرحبا به فنعم المجيء جاء • ففتـــح فلـما خَلَصت [وصلت] إذا يحيى وعيسى [عليهما السلام] وهما ابنا الخالة[1]:

پوورزای یەکن چونکە حەنەی دایکی مریەمو ژنـــی عیمران لەگەڵ ئیشاعی ژنی حەزرەتی زەکەریا هەردوکیان کچـــی فاقووذن • کـــە وابێ حەزرەتی یەحیا ـ علیه السلام ـو دایکی حەزرەتی عیسا ـ علیه السلام ـ پوورزای یەکن ، بەو واسیطە خۆیشیان ئەبن بە پوورزای یەك •

قال : هذا يحيى وعيسى فسلّم عليهما ، فسلمت عليهما فردّا ، ثم قالا: مرحبا بالأخ الصالح والنبي الصالح • ثم صعد بي إلى الســـماء الثالثـة فاستفتح ، قيل : من هذا ؟ قال : جبريل • قيل : ومن معك ؟ قـــال : محمد • قيل : وقد أرسل إليه ؟ قال : نعـم • قيل : مرحبا بــه فنعـم المجيء جـــاء :

چ هاتنێکی باشە ئەو هاتنەی کە ئەو هاتوە • ( ففتح فلما خلَصْت ): کە لە ڕێی ئەو ئاسمانە خەلاص بووم‌و چوومە ناوی •

إذا يوسف [عليه السلام] قال : هذا يوسف فسلّم عليه ، فســلمت عليه ، فردّ ثم قال : مرحبا بالأخ الصالح والنبي الصالح ، ثم صعد بي حتى أتى السماء الرابعة ، فاستفتح ، قيل : من هذا ؟ قـال : جبريـل ، قيل : ومن معك ؟ قال : محمد • قيل : أو قد أرسل إليه ؟ قال : نعم•

---

(1) دانــەر ـخـ ســەرەتای ئەمپارچەی تەرجەمە نەکرد ؛ چونکـە وەك پارچە پێشوەکە وایــە •

قيل : مرحبا به فنعم المجيء جاء ، ففتح • فلما خلصت إلى إدريس قال : هذا إدريس [عليه السلام] فسلِّم عليه ، فسلمت عليه فرد ، ثم قـال : مرحبا بالأخ الصالح والنبي الصالح :

نەیفەرموو ئیبنی صالح ؛ چونکە ئیدریس ـ علیه السلام ـ لە باپیرانی پێغەمەر نیە ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـو باپیری حەزرەتی نـووح نیە ـ علیه السلام ـ •

ثم صعد بي حتى أتى السماء الخامسة فاستفتح ، قيل : من هـــذا ؟ قـال : جبريل • قيـل : ومن معـــك ؟ قـــال محمــــــد ـ صـــلى الله تعـــالى عليـــه وســـــلم • قيـل : وقـد أرســـل إليـه ؟ قال : نعم • قيل : مرحبا به فنعم المجيء جاء • فلما خلصت فإذا هارون [عليه السلام] قال : هذا هارون فسلم عليه ، فســلمت عليه • فرد ثـم قال : مرحبا بالاخ الصالح والنبي الصالح • ثم صعد بي حتى أتى السماء السادسة ، فاستفتح ، قيل : من هذا ؟ قال : جبريل • قيل [و• ذر] من معك ؟ قال : محمد • قيل : وقد ارسل إليه ؟ قال : نعم • قال : مرحبا به فنعم المجيء جاء • فلما خلصت فإذا موسى [عليه السلام] قال : هـذا موسى فسلِّم عليه • فسلمت عليه ، فرد ثم قال : مرحبا بالأخ الصـالح والنبي الصالح ، فلما تجاوزت بكى • قيل له : ما يبكيك ؟ قال : أبكي لأن غلاما بعث بعدي يدخل الجنة من أمته أكثر من يدخلها من أمتي :

**تەرجەمە :**

کە لە حەزرەتی مووسا ـ علیه السلام ـ تێپەڕ بووم حەزرەتی مووسا گریا ، لێیپرسرا : بۆچی ئەگریت ؟ فەرمووی : ئەگریم چونکی غولامێ لە دوای من نێرراوە بە پێغەمەریی لە ئوممەتی من ، زیاتر لە ئوممەتی ئەو ئەچێتە بەهەشتەوە • [ ئەمە لە حەزرەتی مووســا ـ علیه الســلام ـەوە حەسەد نیە ، حاشا هەموو پێغەمەران لە حەسەدەوە دوورن • ئەمـە هەم

غيبطەیەو عیبطە دروســـتە • هەم ئەســـەفە بۆ ئەمە كە ئەجری پێغەمەران ـ عليهم صلوات الرحمن ـ بە قەد ئەجری ئوممەتیانە ، تا ئوممەتی زیاتـر بێ ئەجری زیاتر ئەبێ ، بەوە كە ئوممەتی كەمترە لە ئوممەتی پێغەمەری ئێمە ـ عليه الصلاة والسلام ـ ئەجری كەم ئەبێ ، بۆ ئەوە گریاوە ] •

ثم صعد بي إلى السماء السابعة فاستفتح جبريل • قيل : من هذا ؟ قال : جبريل • قيل : ومن معك ؟ قال : محمد • قيل : وقد بعث إليه ؟ قال : نعم • قال : مرحبا به ، فنعم المجيء جـــاء • فـلما خلصت فإذا إبراهيم ـ عليه السلام ـ قال : هذا أبوك فسلّم عليه =قال= فسلمت عليه فردّ السلام قال : مرحبا بالابن الصالح والنبـي الصالح • ثم رفعت لـي سدرة المنتهى • فإذا نبقها مثل قلال هَجَر ، وإذا ورقها مثل آذان الفيلة• قال : هذه سدرة المنتهى ، وإذا أربعة أنهار : نهران باطنان ، ونهـــران ظاهران • فقلت : ماهذان ياجبريل ؟ قال : أما الباطنان فنهران في الجنـة [السلسبيل والكوثر] وأما الظاهران فالنيل والفرات ، ثم رفـع لي البيت المعمور ، ثم أتيت بإناء من خمر =وإناء من لبن= وإناء من عسل، فأخذت اللبن • فقال : هي الفطرة [التي • ذر] أنت عليها وأمتك • ثـم فرضت عليَّ الصلوات خمسون صلاة كل يوم ، فرجعت فمررت على موســـى • فقال : بما أمِرْتَ ؟ قال : امرت بخمسين صلاة كل يوم • قـــال : إن أمتك لا تستطيع خمسين صلاة كل يوم • وإني والله قد جربت الناس قبلك وعالجت بني إسرائيل أشد المعالجة ، فارجع إلى ربك فاسـألـه التخفيف لأمتك • فرجعت فوضع عني عشرا :

**تەرجەمە :**

لە دواییا سیدرەتی موئتەهام بـــۆ دەرخرا ، بەری وەكو جەڕڕەی هەجەر بوو ، گەڵای وەك گوێی فیل بوو ، فەرمووی : ئەمە ( ســـدرة المنتهى )ایە • تێفكریم چوار نەهری لە بن ئەهاتەدەرێ ، دوو نەهری لـە

باطینەوە دوو نەهری لە ظاهیرەوە بوو • وتم ئەی جیبریل ئەم نەهرانە چین؟ فەرمووی : دوو نەهرە باطینیەکـە : دوو نـەهـرن لــە بەهـەشـتان ، دوو نەهرە ظاهیریەکە نیلەو فوراتە • لە دواییا ( بیت المعمور )م بۆ دەرخرا، لە دواییا پیاڵەیێ شــەرابو پیاڵەیێ شــیرو قاپێ هەنگوینیان بۆ هێنام • شیرەکەم وەرگرت ، جیبریل فەرمووی : ئەو پیاڵە شیرە فیطرەتی ئیسلامییە کە تۆو ئوممەتتی لەسەرن • لە دواییا هەر رۆژێ پەنجا نوێژم لەســـەر فەرزکرا ، گەڕامەوە بە لای حەزرەتی موسا ـ علیه السلام ـ ا رابوردم ، فەرمووی : ئەمرت بە چی پێکراوە ؟ وتم : ئەمرم پێکراوە رۆژی بە پەنجا نوێژ • فەرمووی : ئوممەتی تۆ رۆژی تاقەتی پەنجا نوێژیان نیە ، وەڵلاهی من لە پێش تـۆدا ئینســانم تەجرەبــە کــردوە ، زۆرم زەحمەت لەگەڵ بەنیئیسرائیلا کێشاوە ، موراجەعەی خوای خۆت بکە ، طەلەبی تەخفیفی لێ بکە بۆ ئوممەتەکەت • پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی: موراجەعەتم کرد دە نوێژی بۆ داشکانم •

فرجعت إلى موسى فقال مثله فرجعت فوضع عني عشرا ، فرجعت إلى موسـى ، فقـال مثلـه ، فرجعت فوضـع عني عشـرا ، فرجعت الى موسى فقـال مثلـه ، فرجعت فأمِرت بعشر صلوات كـل يـوم ، فـرجعت فقـال مثله ، فرجعت فأمرت بخمس صلوات كل يوم ، فرجعت إلى موســـى ، فقال : بما أمِرت ؟ ( بە چی ئەمرت پێ کـرا ؟ ) قلت: أمِرتُ بخمس صلوات كل يوم : ( وتم : رۆژی بە پێنج نوێژ ئەمرم پێ کرا ) قـال : إن أمتك لا تستطيع خمس صلوات كل يوم ، وإني قد جربت الناس قبلك ، وعالجت بني إسرائيل أشد المعالجة ، فارجع إلى ربك فاســأله التخفيف لأمتك ( تەرجەمەی رابورد ) قال : سألت ربي حتى استحييت ، ولــكن أرضى وأسَلِّم • قال [عليه الصلاة والسلام] : فلما جاوزت ناداني مناد : أمضيت فريضتي ، وخففت عن عبادي ح ـ ١٩٦/٦ :

**تەرجەمە :**

وتم : زۆرم طەلەبکرد لە خوا ـ عز وجل ـ ئەوەندەم لێ طەلەب کرد تا حەیا گرتمی، (لکن)بەوە رازیی ئەبمو =خۆم= تەسلیمی ئەمری ئەکەم، کە لای حەزرەتی مووسا تێپەڕ بووم موناديێ بانگی کردم : کە فەرزی خۆمم کە عیبادم پێی موکەللەف کردوە ئیمضا کرد ، هیچ زیادیو کەمی نیە ، لە عیبادی خۆیشم تەکلیفم سووك کرد •

لە موسلیما م-٢/٨٢ بە موختەصەریی ئەم حەدیثە هەیە • لە ئەوەڵیەوە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : لە وەختێکا کە لە لای بەیتەوە نوستبووم لـە بەینی خـەوو بێداریيا بـووم گوێم لێ بوو یەکێ ئەیوت : یەکێ لەو سیانە کـە لـە بەینی دوانایە منیان بـرد ، تەشتێکی ئاڵتوونینیان بۆ هێنام ئاوی زەمزەمی تیا بوو ••• ( الــخ ) بەحثی پیاڵەی هەنگوینی تیا نیە ، ئەوەی تیایە شیرەکەم ئیختیار کرد پێیانوتم : ئیصابەتت کرد ، بە واسیطەی تۆوە خوا ئوممەتەکەت موصیب بکا ، ئەوەیشی کـە ( بیت المعمور ) رۆژی حەفتا هەزار مەلائیکەی ئەچێتە ناوەوەو کە هاتنەدەرێ ئیتر عەودەت ناکەنەوە ناوی =تیا نیە= • ئەوە ئاخری ئەوەیە کە ئەوانـی لەسەرن ، یەعنی چوونە ناو ( بیت المعمور )ەوەیانو عەوەدەت نەکردنەوەیان ئاخری حاڵی ئەو مەلائیکەتانەیە •

ئەم سێ حەدیثە لە حەدیثی میعراج بەسە • دەلالەت ئەکەن لە ســەر ئەوە کە :

ئیستیذانکردن سوننەتە •

ئەوانەی کە ئیستیذان ئەکەن ئەبێ تەواو تەحقیقی حاڵیان بکرێ ئەمجا ئیذن بدرێن •

سەلام سوننەتە جوابی فەرزە •

دۆعای خێر بۆ ئەقران سوننەتە •

ڕێگەپێنیشاندان سوننەتە •
موراعاتی ئەحوالی تەبەعە لازمە •
رجاو ئیلتیماس بۆ ژێردەستە سوننەتە •
پێنج نوێژ فەرزە کەم نابێو زیاد نابێ •
شیرو هەنگوین ئەفضەلی طەعامن •
شیر لە هەنگوین ئەفضەلترە •

لەم حەدیثانە وا دەرەکەوێ کە دوو دەفعە شیرو شەراییان بۆ هێنابێ ؛ دەفعەیێ لە ( بیت المقدس ) دەفعەیێ دوای چوونی بۆ ( بیت المعمور )و پێش فەرزبوونی نوێژ • دەفعەی دوایـــی هەنگوینی عەلاوەکراوە • دەلالەت لەسەر ئەمە ئەکەن کە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ بـــێ واسیطە تەکەللومی لە حوزووری ذاتی ئەقدەسا فەرموە ، ذاتی ئەقدەسیش بـــێ واسیطە تەکەللومی لەگەڵ حەزرەتی حەبیبی خۆیـــا کردوە ، ئەمما خوای دبوە ؟ یا نەیدیوە مەعلووم نیە •

بوراق دیارە کە هەڕا ناکـــا • حەزرەتی جیبریلو حەزرەتی پێغەمەر ـ علیهما الصلاة والسلام ـ بەجێ ناهێڵێ • بۆچی بەستیەوە ؟ بۆ تەعلیمـــی ئوممەتە کە ئیهتیمام بکەن بـــە حیفظی مالـــی خۆیان ( اعقل وتوكَّل )[1] بەهەشت مەخلووقە ئەلئان مەوجوودە ، لە ئاسمانی حەوتەمە • ئەگونجـێ مادەی نیلو فورات لە بەهەشتەوە بێ • میعراج جیسمانیە •

٦٠٣/٤ ـ ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما] قال : قال رســول الله ـ صـلى الله تعــالى عليـــه وســــلم ـ : مررت ليلــة أســــــري

(١) مەبەستی ئەو حەدیثەیە کە عەرەبێك وتی : وشترەکەم بەرەڵا ئەکەمو تەوەکول بەخوا ئەبەستم . پێغەمەر ـ صلی الله تعلیا علیه وسلـم ـ فەرمووی : وشترەکەت ئەشکیڵ بکە ئەوسا تەوەکول بکە .

بي على مـوســى بن عمــران [ عليــه الســلام ] رجــل آدم طوال جعد كأنه من رجال شنوءة [قبيلة] ورأيت عيسى بن مريم [عليهما الســلام] مربوع الخلق إلى الحمـرة والبياض سَبْطَ الرأس [بفتحتين ، أو فتح فكسر ، أو كسر فسكون ، أو فتح فسكون •لغات ] وأري مالكا خازن النار والدجال في آيات أراهن الله إياه (فلا تكن في مرية من لقائه )[1]قال : كان قتادة يفسرها ان نبي الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قد لقي موسى ـ عليه السلام ـ م ـ ٢/٨٧ •

**تەرجەمە :**

ئیبنوعەبباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ =ئەفەرموێ= : شـــەوی میعـــراج بـە لای حەزرەتی مووسادا رابوردم ، پیاوێکی گەندم گوون بوو ، درێژ بوو ، کەڵەگـەت بوو ، مووی سەری لوول بوو ، وەك پیـــاوی قەبیلەی شەنوئە بوو ، چاوم بە عیسا کەوت ، چوارشانەو تێکسمڕاو بوو ، نـــە درێژ نە کورت بوو • مووی سەری صاف بوو ، مالیکی ئاگرموانـی جەهەننەمم پێنیشان درا ، دەججالم پێنیشاندرا لەگەڵ چەند ئایەتێ کە خوا پێنیشـــانی دا • راویی ئەڵێ : خوا فەرموویەتی : شوبهەت نەبێ لەمەدا پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لەگەڵ حەزرەتی مووسادا مولاقاتی بوە • قەتادە ئایەتەکە وا تەفسیر ئەکاتەوە کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وســلم ـ مولاقیی حەزرەتی مووسا بـوە •

٦٠٤/ه ـ عبدالله بن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ أن رسـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : بينا أنا نائم أطـوف بالكعبة فـإذا رجل آدم سبط الشعر ينطف أو يهراق رأسه ماء • قلت : من هـذا ؟ قـالوا : ابن مريم • ثم ذهبت ألتفت فإذا رجـل جسـيم ، أحمر ، جعـد

(١) الســجدة / ٢٣ •

الرأس ، أعور العين ، كأن عينه عنبة طافية [بارزة] قالوا : هذا الدجـال أقرب الناس به شبها ابن قطن رجل من خزاعة ح ـ ٢٠١/١٠ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : لە وەختێکا کـە نوستبووم [ خۆمم دی ] طەوافی کەعبەم ئەکردکەچی پیاوێکی گەندمگوون لەوێ بوو ، مووی سەری صـاف بوو ، ئاوی لەسـەر ئەتکا [ ئەوەندە مووێیکی پاك‌و جوانی بوو ] وتم : ئەوە کێیە ؟ وتیان : ئەوە ئیبنومەریەمە• لە پاشا رۆییم تەماشـای ئەملاو ئـەولام ئەکرد ، کە تێفکریم پیاوێـکی زەلام‌و ، سوورو ، مووگرژو لوول ، چاوی وەك بۆلەترێ هـەلتۆقیـوو بەرزبووبوەوە •• لەوێ بوو ، وتیان : ئەوە دەججالە ، ئەوی زۆر بـەو بشوبهێ ئیبنوقەطەنە کە پیاوێکە لە خەزاعە •

٦٠٥/٦ ـ عن أبي العالية عن ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : سرنا مع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بين مكة والمدينة فمررنا بواد ، فقال : أي واد هذا ؟ فقالوا : وادي الأزرق • فقال: كأني أنظر إلى موسى ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فذكر =من= لونه وشعره شيئا لم يحفظه داود [أحد الرواة] واضعا أصبعيه في أذنيه ، له جؤار إلى الله ( رفع الصوت ) بالتلبية ، مارّاً بهذا الوادي • قال : ثم سـرنا حتى أتينا على ثنية ، فقال : أي ثنية هـذه ؟ قالـوا : هَرْشى ، أو لَفْت [وبفتحتين] فقال : كأني أنظر إلى يونس [عليه السلام] على ناقة حمـراء عليه جبة صوف خِطام ناقته ليف خلبة ، مارا بهذا الوادي ملبيا م ـ ٢/٨٩•

**تەرجەمە :**

ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : لـە خـدمەت پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئەڕۆیین لە بەینی مەککەو مەدینەدا

به لای دۆڵێکا رۆیین فەرمووی : ئەمە چ دۆڵێکە ؟ وتیان : ئەمە دۆڵـی ئەزرەقە • فەرمووی (كأنه)تەماشای حەزرەتی مووسا ئەکەم ـ علیه الصلاة والسلام ـ ئەبولعالیە ذیکری رەنگ‌و مووی کرد • داود حیفظی نەکردوە دوو پەنجەی نابوە ناو هەردوو گوێیەوە بە دەنگی بەرز (لبيك)ی ئەکرد دەنگی بۆ درێژ ئەکردەوەو بەم دۆڵەدا ئەڕۆیی • فەرمووی : لە دوایـا رۆیین تا هاتینە پێچپێکەوە • فەرمووی : ئەم پێچە چ پێچێکە ؟ وتیان : هەرشایە ، یا لەفتە • فەرمووی • (كأنه) تەماشای (یونس) ـعلیه السلامـ ئەکەم لەسەر وشترێکی سوور ، جببەیێکی خوریی لەبەرا بوو ، مەهاری وشترەکەی لە پووشی خولبە بوو ،بەم شیوەدا ئەڕۆیی •

عن أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : أتيت وفي رواية هداب : مررت على موســى [ عليه السلام ] ليلة أسري بي عند الكثيب الأحمر وهو قائم يصلي فــي قبـره م ـ ٩/٢٤٧ •

**تەرجەمە :**

ئەنەس ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی: لەو شەوەدا کە ئیسرام پێ‌کرا بە لای حەزرەتی مووسادا رابوردم لـە لای کەثیبی ئەحمەرەوە [گردی لمی سوور] راوەستابوو نوێژی ئەکرد لـــــە قـەبـرەکـەیا •

ئەنبیا زیندوون ئارەزووی چییان بێ‌و چییان لە لا خۆش بێ ئەیکەن، یا موکەللەفیش نەبن‌بە عیبادەت ( وجوه يومئذ ناضرة إلى ربها ناظرة ) لـە حوضووری ئەقدەسی ئیلاهییا وەستان لە هەموو نیعمەتی دنیاو ئاخیرەت بـەلەذەتـتـرە •

٦٠٦/٧ ـ عن جابر ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : عرض علي الأنبياء فإذا موسى ـعليه السلام ـ ضَرب من الرجال [خفيف اللحم ليس بضخم ولا ضعيف] كأنه من رجال شنوأة • ورأيت عيسى بن مريم ـ عليهما السلام ـ فإذا أقرب من رأيت =به= شبهًا عروة بن مسعود • ورأيت إبراهيم ـ عليه السلام ـ فـإذا أقرب من رأيت به شبها صاحبكم ـ يعني نفسه ـ ورأيت جبريل ـ عليـه السلام ـ فإذا أقرب من رأيت به شبها دَحْية • وفي رواية ابن رمح : دحية بن خليفة م ـ ٩٢/٢ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليـــه وســـلم ـ فەرمووی : پێغەمەرانم پێنیشاندرا ،مووسا ـ عليه السلام ـپیاوێ بوو نە گۆشتنی زۆر گۆشتن نە زەعیف بوو ، (كأنه) لە پیاوانی قەبیلەی شەنۆئە بوو • حەزرەتی عیسا ـعليه السلام ـمدی لەوانەی کە دیومن بە عوروەی بنی مەسعوود زیـاتـر ئەشوبها • حەزرەتی ئیبراهیم ـ عليه السلام ـمدی زیاد لە هەموو کـەس بەرەفیقی ئێوە کە منم ئەشوبها • حەزرەتی جیبریل ـعليه السلام ـم دی زیاد لەوانەی کە دیومن بە دەحیەی کوڕی خەلیفە ئەشوبها [یەعنی لە صوورەتی بەشـەریدا ] •

٦٠٧/٨ ـ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قال النبـي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ [ليلة •خ] حين أسري بي[رأيت •خ] لقيت موسى عليه‌السلام ـ فنعته النبي ـصلى‌الله‌تعالى‌عليه‌وسلم ـ فإذا رجل‌حسبتُهُ [ضرب خ بلا شك] قال مضطرب : رَجِل الرأس كأنه من رجال شنوءة • قال : [ورأيت •خ] ولقيت عيسى [عليـــه الســـلام] فنعته النبي ـ عليه السلام ـ فإذا ربعة أحمر كأنما خرج من دِيماس ؛ يعني حماما • قـال :

ورأيت إبراهيم ـ عليه السلام ـ وأنا أشبه وَلَدِه به • قـال : فـأتيت بإناءين في أحدهما لبن وفي الآخر خمر [ فقال : اشرب • خ] فقيل لي : أيهما شئت ، فأخذت اللبن فشربته • فقال : [أخذت خ بلا شك ] هديت الفطرة ، أو أصبت الفطـــرة • أما إنـك لو أخـذت الخمر غـوت أمتك ح ـ ٣٧٤/٥ ، م ـ ٩٣/٢ ، ت •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : لەو شەوەدا کە ئیسرام پێ کرا حەزرەتی مووسا ـ عليه السلام ـم دی ، پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وەصفی کرد فەرمووی : پیاوێ بوو میانە ؛ نــە قەڵەو نە زەعیف ، مووی سەری وەك بە شانە داهاتبێ رێكو صـاف ، وەکوو لە پیاوانی شەنۆئە =بێ= • حەزرەتی عیسـا ـ عليه السلام ـم دی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وەصفی کرد فەرمووی : پیاوێکی بەینەبەینە بوو؛ نە کورت نە درێژ ،نەقەڵەو نە زەعیف ، رەنگ‌سووروئاڵ وەك لە حەمام هاتبێتە دەرێ • حەزرەتی ئیبراهیم ـعليه السلامـم دی نە ئەولادی ئەو لە هەموویان زیاتر من بەو ئەشوبهێم • فــەرمـووی : دوو زەرفیان بۆ هێنام یەکێکیان شیری ، ئەوی تـریـان شـــەرابی تیا بوو • پێیان‌وتم : کامیانت هەوەس پێێ بیخـــۆروە • شـــیرەکەم وەرگـــرت خواردمەوە پێیان وتم : فیطرەتی ئیسلامەتیو رێی راستت وەرگرت، ئەگەر شەرابەکەت وەربگرتایە ئوممەتەکەت رێیان ونئەکرد •

٦٠٨/٩ ـ قال عبدالله بن عمر [رضي الله تعالى عنهما] : ذكر رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يوما بين ظهراني الناس المسـيح الدجال • فقال : إن الله ـ تبارك وتعالى ـ ليس بأعور ، ألا إن المسيح الدجال أعور عين اليمنى ، كأن عينه عنبة طافية • قال : وقال رســول الله ـ صلى الله

تعالى عليه وسلم ـ : أراني الليلة في المنام عنـد الكـعبة فإذا رجل آدم كأحسن ماترى من أدْم الرجال تضرب لِمَّته بين منكبيه رَجِل الشعر يقطر رأسه ماء ، واضعا يديه على منكبي رجلين وهو بينهما يطوف بالبيت فقلت : من هذا ؟ فقالوا : المسيح بن مريم ـ عليهما السـلام ـ ورأيت وراءه رجـلا جَعْدا قططا ، أعور العين اليمنى كأشبه من رأيت من الناس بابن قطن ، واضعا يده على منكبي رجلين يطوف بالبيت ، فقلت : من هذا ؟ قالوا : هذا المسيح الدجال • وفي أخرى : أحمر جعد الرأس • وفي أخرى أحمر جسيم جعد الرأس ح ـ ٥/٤١٦ ، م ـ ٢/٩٦ • اللفظ لمسلم •

**تەرجەمە :**

عەبدوڵڵای بنی عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فەرمووی : رۆژێ پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە ناو خەڵقا بەحثی لە مەسـیحی دەججال فەرموو ، فەرمووی : خوا ـ تبارك وتـعالى ـ یەکچاو نیـــە ، مەعلومتان بێ کە مەسیحی دەججال یەکچاوە • چاوی راســتی وەك بۆلەترێ بەرزبۆتەوەو دەرپەڕیوە • عەبدوڵڵا فەرمووی : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : شەوێ لە خەوما خۆم لای کەعبە بینی• ئەوێ پیاوێك بوو ئەسمەر [سووروسپی] وەك جوانترینی ئەو ســوورو سپیانەی کە لە ناو ئینسانا هەن • مووی سەری لە مابەینی هەردوو شانی ئەدا داهێنرابوو سەری ئاوی لێ ئەتکا [ یا لە بەر بەڕیاقیی ئینسان وای ئەزانی کە ئاوی لێ ئەتکێ ، یا تازە سەری داهێنابوو لـە حەقیقەتـا ئـەو ئاوەی کە سەری پێ داهێنابوو لە سەری ئەتکا ] هەر دوو دەستی لەسەر دوو شانی دوو پیاوا دانابوو ، طەوافی بەیتی ئەکرد • وتم : ئەمە کێیـە ؟ وتیان : ئەمە عیسای کوڕی مەریەمە ـ عليهما السلام ـ لە دوای ئەوەوە پیاوێکی موو گرژو لوولم دی چاوی راستی کوێر بوو ، لە ناو ئینسانا

ئەوی زۆری پێ بشوبهێ ئیبنوقەطەنە [ زوهریی ئەڵێ : ئیبنــوقــەطــەن پیاوێکە لە خەزاعە لە زەمانی جاهیلییەتا بە هیلاك چوە ح ـ ٥/٤١٧]دەستی خستبوە سەر شانی دوو ، پیاو طەوافی بەیتی ئەکرد ، وتم : ئەمــە کێیە ؟ وتیــان : ئەمە مەسیحی دەججالە •

[دەججال ناچێتە مەککەو مەدینە ، یا ئەڵێین پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیە وسلم ـ لە خەویا وای دیوە • ئەم تەئویلە زەعیفە ، چونکی خــەوی ئەنبیا وەحیەو حەقیقەتە • یا ئەڵێین : نەچوونەمەککەو مەدینەی لە دوای خورووجو زەمانی ئیستیلایایەتی ] ئەم حەدیثانە کە بەحثیدەججالی تیــایە موناسبی بەحثی فیتنە یا ئەحادیثی ئەنبیایە ؛ چونکی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیە وسلم ـ لە شەوی میعراجا دەججالیشی دیوە بەو موناسەبەیــە لێرەدا نووسیومە حەز ئەکەن نەقلی بکەنە ئەوێ •

١٠/٦٠٩ ـ عن جابر ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : لما كذبتني قريش قمت في الحِجر فجلاّ الله لي بيت المقدس ، فطفقت أخبرهم عن آياته وأنا أنـظر إليــه ح ـ ٦/١٩٥ ، م ـ ٢/١٠١ ، ت ، ن ، ح ـ ٧/١٩٣ • وفي حديث ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنه ـ عند النسائي : فقال القوم : أما النعت فقد أصابالقسطلاني ـ ٧/١٩٣ •

**تەرجەمە :**

جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ کە لە پێغەمەری بیستوە ـ صلی الله تعالی علیە وسلم ـ فەرمووی • کە قورەیش تەکذیبیان کردم خوا ـ عــز وجل ـ (بیت المقدس)ی بۆ دەرخستم [ یەعنی حیجابی بەینی منو ئــەوی لە بەینا هەڵگرت ] دەستم کرد بە خەبەرپێدانو تەماشای ( بیتَ المقدس )م

ئەکرد یەعنی کە شتێکیان لێ ئەپرسیم لە عـەلامەتـی ، تەماشـای ( بیت المقدس)م ئەکردو خەبەرم ئەدانێ •

[بەیهەقی لە دەلائیلیا لە ئەبوسەلەمەوە ـ رضي الله تعـالى عنـــه ـ ریوایەت ئەکا خەڵق لە دوای ئیسرا سەریان لێ تێكچوو چەند کەسێکیان هاتنە خذمەت حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەرزیانکـرد • فەرمووی : شەهادەت ئەدەم کە راستی فەرموە • وتیان: لەوەیشـا پێـی باوەڕ ئەکەی بە شەوێ بچێتە شامو بێتەوە ؟ فەرمووی : لە شتی لــەوە دوورتر لە عەقڵەوە پێی باوەڕ ئەکەم ، لە خەبەری ئاسمانا پێـی بـڕوا ئەکەم ، لە بەر ئــەوە ناوبرا بە صـەدیق ـ رضــي الله تعـالى عنه ـ قەسـطەلانیی •

ئەبوسەلەمە مەدینەیی‌یە ئەبێ لـە حەزرەتی صەدیقی ئەکبەری بیستبێ ـ رضي الله تعالى عنه ـ کە وابێ حەدیثەکەی مورسەلی صەحابییە •

٦١٠/١١ ـ عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] قال : قال رسول‌الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : لقد رأيتني في الحجر وقريش تسـألني =عن مسراي فسألتني= عن أشياء من بيت المقدس لـم أثبتها ، فكُرِبت كُربة ماكربت مثله قط • قال : فرفعه الله لي أنظر إليه ، مايسألوني عن شيء إلا أنبأتهم به • وقد رأيتني في جماعة من الأنبياء ، فإذا موســـى ـ عليه السلام ـ قائم يصلي ، فإذا رجل ضرب جعد كأنه من رجـــال شنوأة ، وإذا عيسى بن مريم ـ عليهما السلام ـ قائم يصلي ، أقرب الناس به شبها عروة بن مسعود الثقفي • وإذا إبراهيم ـ عليه السلام ـ قـائم يصلي أشبه الناس بـه صاحبكم ، يعني نفسه ـ صلى الله تعـالى عليــه وسلم ـ فحانت الصلاة فأممتهم ، فلما فرغت من الصلاة قال لي قـائـل : يا محمد هذا مالك صاحب النار فسلِّم عليه ، فالتفت إليه فبدأني بالسلام م ـ ١٠١/٢ •

